# روشنبیری نوێ



ژماره ۸۰ مایس ۱۹۸۰

میهرەجانی یەکەمی روشنبیریی کوردی لە هەولێر

1980-4-20 1980-4-26

وزارة الثقافة والاعلام

دار الثقافة والنشر الكردية

المهرجان الثقافي الكردي الاول في اربيل

# وشەی پرشنگدار

برایان رۆلەکانی ناحیەی خەلیفان سلاوو بەرەکەتی خواتان لێبێ لەوانەیە هەندێکتان عەرەبی نەزانن یان بە باشی تێنەگەن ، هەر چۆنێبێ برایان هیوام وابو بە کوردی قسە بکەم ، بەلام مۆلەتم بدەن تا زمانی کوردی فێر ببم .

ناحیەکەتان ناحیەکی گرنگە ، لە سەر رێگای دوەلیەو بێگانەو عیراقیەکانی پیا دەرۆنو دێنە سەردانی ، بینیم خانوەکانی ناحیەکە ، خانوی هاووولاتیەکان چاك نین ، پێویستە خانوەکانتان جوان تر بێ لە هی ئێستا .

برایانم .. خومەینی ماوەیەك لەمەوبەر خەوی بینیبوو بەیانی زوو لە خەو رابوو بەیانێکی دەرکردو تیایدا ووتی کاتێك کە صدام حسین سوپای عیراقی بەسەر دەکردەوە سوپای عیراق گودەتایەکی گردوەو ئەویان کوشتوە .

برا کوردەکانم .. ئیمپریالیزم باس لە ئێوە دەکاتو دەلێ کوردەکان لەگەل شۆڕشدا نین کوردەکان ئەو حکومەتەیان خۆش ناوێ کە صدام حسین سەرۆکایەتی دەکاو ئێوە دژی حزبی بەعسنو .. لەگەل شۆڕشی ١٧ ای تەمووزدا نین .

بەلێ ئێمە دەزانین کە کوردو عەرەبو هەموو عیراقیەکان لەگەل شۆڕشە مەزنە کەیانن ئەو شۆڕشەی کە لە زولمو دواکەوتوویی رزگاریکردن.. شۆڕشەکەیان کە کامەرانیو شادمانی بۆ هەموو عیراقیەكو هەموو پیرێك وەدەست هێناو ئەو ئاواتانەی هێنایە دی کە کەسو کارمان بۆی دەژیانو نەیان توانی تا ئێستا لە ژیاندا بەردەوام بن .. ئێمە دەزانین کە سوپاو گەلو کوردو عەرەبو تورکمانو هەموو عیراقیەکان لەگەل شۆڕشەکەیان دان بەلام ئیمپریالیزم هەر خەو بە ولاتەکەتان خەو بە بەروبوومی ولاتەکەتانەوە دەبینێو دەیەوێ بتان چەوسێنێتەوە هەروەکو چۆن لە زەمانی ئینگلیزەکاندا دەیچەوساندنەوە بەلام بەناوی هەمووتانەوە بە ئیمپریالیزم دەلێین لە ولاتەکەمان دەرچووو لێرە بە دواوە گەڕانەوەی بۆ ولاتەکەمان نییە .

ئێمە بە ئیستیعمار دەلێین گەلی عیراق شمشێری سەلاحەددینی ئەیوبی بەدەستەوەیە ، گەلی عیراق شمشێری گەورەمان ئیمامی عەلی بەدەستەوەیە ..

گەلی عیراق شمشیری هەموو سەرکردە مسولمانە عیراقیە ئیماندارەپێشینەکانی بەدەستەوەیە ، ئەم گەلە ناترسێت نە لە ئیستیعمارو نە لە دەستو پێوەندەکانی لە کۆنو نوێ ..

براکانم .. ئێمە لە هاوینی سالی رابوردوودا سەرمان لە ناحیەی خەلیفاندا و ئێستاش سەرمان لێداون ئەگەر خوا حەزی لێ بێت

هەموو سالێك دەتان بینین . وەهەمیشە بەسەر بلندیو سەرفرازی دەتانبینین .

**سەرۆکی فەرماندە**
**صدام حسین**

# لەم ژمارەیەدا




رۆشنبیری نوێ

گۆڤارێکی گشتی مانگانەیە

دەزگای ڕۆشنبیری وبڵاوکردنەوەی کوردی دەری دەکات

ناونیشان: دار الثقافة والنشر الکردیة ـ ساحة الفلاح ـ بغداد

تەلەفۆن: ٨٨٧٥٧٩٥ پێنج خەتە

سەرنووسەر

اسماعیل رسول

جێگری سەرنووسەر

فائق جمیل

# ڕەوانەوەی دوو ڕەخنە

مسعود محمد

● لـــه ژمـــــاره ( ٧٦ )ی ( ڕۆشنبیری نوێ )ی ئەیلوولـــی ١٩٧٩ گـــــۆتارەکــــەی د. ئاوڕەحمانی حاجـــی مارف بـــه ناونیشانی ( با ڕێزی ێکۆڵینەوەی زانستی بگرین ) گەلێـــك بیروڕای ئەوتۆی تێدا هەن کە نووسەران و خاوەنڕایان بخەنەســەر لێکدانەوە و اێکۆڵینەوە و ئەندێشەش . لێرەدا من بە پێی بۆچوونی خۆم و لـــه ڕوازگەی ڕووناك کردنـــەوەوە دوو خاڵی ئەو گوتـــاره ســوودبەخشە دەدەمە بەر لێـــــدوان ، ئەوەندەی بشتوانم پێڕەوی ئامۆژگاریەکـــەی نووسەر دەکەم لەوەدا کە دەبــــێ لێکۆڵینەوە بـــه ڕێبازی ڕاست و ڕەوانی زانستکارانەدا بڕوات ، هەر نەبێ بایی ئەوەندەی کە دلگەرمی و عاتیفەی تێدا بەکار نەیەت .

● خاڵی یەکەم ئەوەیە کە لە لاپەڕە (١١)ی گۆڤارەکە لـــه بارەی وشەی ( انعـــدام )ی عەرەبییەوە هاتوە کە گۆیا کاتی خۆی کۆنـــه ئەنجومەنی کۆنە کۆڕی زانیاری کورد بە هەڵە وشـــەی ( نەمان )ی بۆ پێشنیار کردوە .

وشەی ( انعدام ) ئەوە دەگەیەنێ کە نەبوون بەســـــر بوونەوەرێكدا بێت ئیتر مادی بێ ئەو بوونەوەرە یا مەعنەوی ، وەك کە دەگوترێ ( انعدام الوزن ) دیارە ( وزن ) لە سەر زەوی هەیە و هەبوە بەڵام لە دوورایـــی هێندە کیلۆمەترە ( انعدام ) دەکات کە ئەمە پاتەوپات ( نەمان ) دەگەیەنێ . ئەوەی ئاشکرایە لە ( فقه اللغه ) ئەوەیە کە فیعل لێی زیاد کرا پتر بەرەو تەئکیدی ( ڕوودان ) دەڕوات و لە ئیحتیمالی واتای ( مطلق ) دوورتر دەکەوێتەوە فیعلی ( انعدام ) یش کە ( مطاوع ) ی فیعلی ( عدم ) یە درەنگتر خۆ بەدەست ئەو واتـــــا موتلەقەوە دەدات کە لە وشـــەی ( عدم ) وەردەگیرێت . دیارە لـــه کوردیشدا ( نەمان ) پتر خزمە لەگەڵ ڕوودان هەرچەند فیعلەکـــەش لێی زیاد نەکراوە ، بۆیـــه نەمان ڕێکتر دێت بۆ ( انعدام ) وەك کە ( نەبوون ) بۆ ( عدم ) دەست دەدات . وشەی ( نەبوونی ) ش هەر ئەو واتایەی (فقر ، عوز)ی هەیە کە د. ئاوڕەحمان بۆی چوە ، وشەکەش لە ڕێی ڕاستە دەستووراتی وشەسازییەوە پەیـــدا نەبوە بەڵکو دارشتنێکی ڕەمەکییە کە هاتوە (ی)ی ئەمرازی ئەبستراکتی خستۆتە پاڵ ( نەبوون ) ەوە کـــه ئەویش هەر ئەبستراکتە . ئـــەم دارشتنە ڕیزپەڕە (شاذ) ناشێ ببێتە بنەمای دەستووری زاراوەســازی ، ئەگینا صـــەد وشـــەی وەکـــو ( نەخوێندنـــی ، نـــەچوونـــی ، نەبیستنی . . ) دەهاتە ناو ئاخاوتن و نووســینی کوردی و زمانەکـــەی دەشێواند . وشەی ڕیزپەڕ لەکوردی و غـــەیری کوردیدا زاوزێ ناکات ، ئەگەر بکات زۆڵ دەهێنێت .

لە بارەی ( نەبوونی ) یەوە نەك ئەوەندەو بەس ، بگرە جارێ هۆی هەرەگەورەی دەست نەدانی لـــه بری ( انعدام ) ماوە ڕوون بکرێتەوە :

وشەی ( نەبوونـــــی ) لە فیعلی ( بوون ) بە واتای ( وجـــود ) ەوە نەهاتوە بەڵکو لە ( هەبوون ) ی بـــه واتای ( تملك ) ەوە وەرگـیراوە . ( هەبوون ) بەواتای ( تملك ) چونکە تێپەڕە لەگەردانـــــدا خۆی لـــه ( هەبوون ) ی بەواتای (وجود) جودا دەکاتەوە ڕاناوی تێپەڕیش لەگـــەل خۆیدا دەهێنێت . لە پێشـــــەوە لیستەی گەردانی ( هەبوونی ) ی بە واتای ( وجود ) دەنووسم :

**من هەم**

**من هەبووم**

**تۆ هەیت**

**تۆ هەبوویت**

**ئەو هەیە**

**ئەو هەبوو**

**ئێمە هەین**

**ئێمە هەبووین**

**ئێوە هەن**

**ئێوە هەبوون**

**ئەوان هەن**

**ئەوان هەبوون**

**ئنجا لیستەی ( هەبوون ) ەکەی ( تملك ) :**

**من هەمە ، هەیەتم**

**من هەمبوو**

**تۆ هەتە ، هەیەتت**

**تۆ هەتبوو**

**ئەو ـ هەیەتی**

**ئەو هەیبوو**

**ئێمە هەمانە ، هەیەتمان**

**ئێمە هەمانبوو**

**ئێوە هەتانە ، هەیەتتان**

**ئێوە هەتانبوو**

ئـەم ڕێژەیـەی ( هەمـە . هەیەتم .. ) ی (تملك) کێشـەی زۆر بەدوادا دێت بە نموونە کە دەڵێت (هەیەتم) مەبەستت کاتی ئێستاکەیە کەچی ڕێژەکەی وەك ( خواردوەتم . کردوەتم ) ە کە جۆرێکە لە رابردوو. دیسان ( هەمبوو ، هەتانبوو .. ) کە ڕێژەی رابردوە جودا بۆتەوە لـە ڕێژەی ڕابردووی تێپەڕی عادەتی کە دەڵێ (خواردبوومان ، کردبوومان..) هەر بۆیەیە ئەوەی تازە کوردی فێر دەبێ دەڵێ ( هەبوومان .. ) . ئنجا موزاریعی ( هەبوون ) یش بە هەردو واتا کێشـە هەڵـدەگرێ کە دێت ڕێژەی موزاریعی (بوون)ی سـادە وەردەگرێ :

من هەم          من دەبم

لە موزاریعی ( هەمە ، هەیەتم )دا کێشـەکە گەورەتر دەبێ کە دێت و ڕێژەی (انتقالی پێچەوانە) وەردەگرێ

من هەمە ، هەیەتم        من دەمبی

ئەم ( انتقالی پێچەوانە ) یە لە کتێبۆڵکەی (چەند حەشارگە..) دا بۆ یەکەم جار باس کراوە ، بەڵام زۆر پێویستی بە شەرح و ڕوونکردنەوە هەیە ، ئێرەش جێگەی نییە .

وا دەزانم کەرتی (هە) لە وشـەی ( هەبوون ) ی بە واتای ( تملك ) خزمی ( avoir ) ی فرەنسـی و ( have ) ی ئینگلیزییە ، بەو پێیە ڕەنگە لە کۆنـدا ( هەڤ بـوون ) بووبێت . بە واتای ( وجود ) یش لـە ( هـسـت ) ی فارسـی و ( est ) ی فـرەنـسـی و ( is ) ی ئینگلیزییەوە نزیکـە . لەهجە هەیە لە کوریدا لـە جیاتی ( هەیە ) دەڵێ ( هەسە ) .

بە هەمە حاڵ ( نەبوونی ) لـە بنەڕەتدا ( نە هەبوونی ) بوە و لێی سواوە ، ئێستاش دەگوتـرێ (هەبوونی و نەبوونی ـ کابرا بابایەکی هەبووە ..) .

لەمەوە دەردەکەوێ کە بە هیچ کلۆجێك ناشێ ( هەبوونی ) بۆ لای ( وجود ) ببرێتەوە ، ئەم ڕواڵەتە چاوغەلەتێنەی لەیەکچـوونی دوو وشـەکەش ناشێ تەلەزگە بە بیرمان بکات و لاتریزەمان پێبەستێ بـۆ دەرەوەی ڕاستە ڕێگەی زمانناسی و زاراوەسازی .

● خاڵی دوەم ئەوەیە کە لـە لاپـەڕە (١٤)ی گۆڤارەکـەدا وا ڕانوێنراوە کە (ن)ی چاوگ بـە کۆتایی فیعلی وەك ( کردن ، ڕستن ) ەوە نانووسێت،گۆیا کورتە بزوێنێکی ورد دێتە نێوان کۆتایی فیعلەکان و نیشانەی چاوگەکەیانەوە بەڵام لـە ڕێنووسی کوردی کە بە پیتی عەرەبی دەنووسرێ بزوێنـەکە وێنـەی بۆ دا نەنراوە ئیتر زمانناسان هەڵەی تێدا دەکەن ، یانی ئەگەر کوردی بـە پیتی لاتینی بنووسرێ نیشانە بـۆ بزۆێنەکە بەکاردێت و هەڵەی تێدا ناکرێ .

با لەپێشـەوە ئەوە بڵێم ، نووسینی لاتینیش وا دەبێ سەر لە نووسەر و لێکۆڵەرەوەی کورد دەشێوێنێت وەك کە دێت و لە بری ( ئا ، ئۆ ، ئی .. ) تەنها یەك پیت دەنووسێت کەچی هەریەکەیان بریتییە لە دوو دەنگی سەربەخـۆی تەواو و چ فەرقێك نییە لە نێوان ( دا ، دۆ ، دی ) و ( ئا ، ئۆ ، ئی ) لە ڕووی ژمارەی دەنگەکانیانەوە ، نووسینی لاتینی کە بایەخی بە دەنگی ( همزە ) نەداوە و لەوەشدا سەهوێکی زلـی کردوە ، کێشـەی بۆ ئێمەش ناوەتەوە کە بەشێکی بەرچاوی لێکۆڵەرەوەی کورد بـە شـوێن هـەنگاوی ئەو سەهوەدا دەڕۆن و دەمەتەقە لەسەر بایەخی دەنگی (همزە) هەڵدەستینن و دانەنانی نیشانە بۆ هەمزە لـە نووسینی کوریدا بە ڕاست دەزانن کەچی دەنگێکی زێدە ڕەسەن و کۆنی زمانەکەمانە ، هەر ئەوەندە هەیە لە ئاخاوتنی ئێستاکەماندا هەمزە لـە ناوتوێژی وشـەدا نەماوە و بە زۆری لە بەرایی وشـەوە دێـت ، تەنهـا لەڕێژەی موزاریع و ئەمر نەبێ وەك : دەئاخێوێ ، دەئەنجنێ ـ بئاخێوە ، بئەنگێوە ، دەتئەزموم .. لە کوریدا دەنگی لامی قەڵەویش لـە بەرایی وشـەوە نایەت کەسیش ناڵێ بـا نیشانەی بۆ دانەنرێت . دەنگـی (ه)ش بە دەگمەن لە ناو توێژی وشـەدا (دەبیسترێ) [نهوم،نهۆ..] .

رەنگە لە ئاخاوتنی ئێستاماندا هەرگیز نەچێتە کۆتایی وشەوە . مەشوورترین وشەی کۆنمان (دئاك) هەمزەی لە هەناودا هەیە.. نووسینی لاتینی کە نیشانەی بۆ ئەو دەنگە کز و بێ‌هێزەی نێوان فیعل و (ن)ی چاوگ داناوە سەرلەنوێ وای‌کردوە بایەخەکی لە ڕادەبەدەر بەو دەنگە بدرێ ، ڕەنگ بوو ئەگەر نووسینی لاتینی لێی بێ‌دەنگ بایە ئەویش وەك ( همزە ) پشت‌گوێ خرابایە . هەرچۆنێك بێ ئەم دەمەتەقەیە لەسەر (تاوانی ڕێنووس) مەبەستی ئێرەکانە نییە ، ئەوەی من بەچاوی خۆمەوە گرتووە لێرەدا شتێکی‌دیکەیە : ئایا ئەو دەنگە کزەی کە لە نێوان ( ت ، ن ) و ( د ، ن )ی دوو فیعلی ( بەستن ، کردن ) دایە ئەویش وەك دەنگەکانی‌دیکەی فیعلەکان ( ب ، ە ، س ، ت ، ك ، ر ، د ) بەشێکی بنجی و پێك هێنەری وشەیە یاخود شتێکی‌دیکەیە ؟ هەڵبەت هەموو کەس هەست بەو دەنگە کزە دەکات لەو شوێنە و لە گەلێك شوێنی‌تریشدا ، کەواتە بابەتی لێکۆڵینەوە بوون و نەبوونی دیاردەکە نییە بەڵکو ( ماهية ) ی دیاردەکەیە : پرسیارمان لێرەدا ( ئایا هەیە ؟ ) نییە بەڵکو ( ئایا چییە ؟ ) یە .

بە نیازی خۆ ڕوون کردنەوە و گوتار کورت کردنەوە وشەی نموونان کە بە پیتی لاتینی بنووسم لە بری ئەو بزوێنە بێ‌هێزە (ı)ی بێ نوختە دادەنێم ، بۆ کورتە بزوێنی ( ی ـ کەسرەی عەرەبی ) ش پیتی (i)ی نوختەدار دادەنێم ، لە جیاتی کورتە بزوێنی فەتحەش ( e ) دەنووسم بۆ (ی)ی درێژیش ، لە هەرکوێیەك بێت ( y ) دەنووسم ، لە جیاتی ( کورتە بزوێنی بێ‌هێز ) یش تەنها وشەی (بێ‌هێز) بەکار دەهێنم ، هەرجارەش بە پێی پێویست بڕگەی وشان لە یەکدی جودا دەکەمەوە تاکو دەوری ئەو بێ‌هێزە لە پێك‌هێنانی بڕگە و کەرت کردنی وشە ئاشکراتر بێت .

لە چاوگی (ڕستن ، کردن)دا ئەگەر بڵێین ئەو بێ‌هێزەی پێش ( ن )ی چاوگەکان بەشێکی پێك هێنەری وشەکانە ئایا دەبێ بە (ن)ی چاوگی بدەین یا بە قەدی فیعلەکە ؟ دیارە ئەو بێ‌هێزە هی قەدی فیعل نییە چونکە لە چاوگی تێنەپەڕدا بەلادانی (ن)ی چاوگ قەدی فیعلەکە دەمێنێتەوە بێ ئەوەی هیچی بێ‌هێز و بەهێزی بە دواوە بێت وەك :

**مردن**

mırd mır—dın

**ڕۆییشتن**

ro-yısht ro-yısh-tın

نموونەی تێپەڕم نەهێنا چونکە بە لادانی نوونی چاوگ ڕاناوی فاعیل دێت و مەسەلەکە ڕوون نابێتەوە .

کەواتە دەمێنێتەوە (ن)ی چاوگ بێ‌هێزەکەی لە قەبەڵ بکەین . ساغ کردنەوەی ئەم لایەنە نەختێك پشووی درێژی دەوێ .

(ن)ی چاوگ هەر لە دوای ( د ، ت ) وە نایەت ، بە دوای ( ا ، و ، ی ) شدا دێت وەك ( فەرموون ، زانین ، کێلاَن ) . لێرەشدا ئاشکرایە،هاتنی ئەو بێ‌هێزە لە دوای بزوێنەکانی ( و ، ی ، ا ) موستەحیلە چونکە بزوێن هەر کۆنسنانتی بە دوادا دێت ، بێ‌هێزەکەش کۆنسنانت نییە.کەواتە دەرکەوتنی ئەو بێ هێزە لە چاوگاندا هەر لە چاوگی دالی و تێ‌یی‌موکینە.

ئێستا قەدی فیعل دەدەینە ڕاناوی لکاوی کەسی یەکەمی کۆ و دەڵین : ( کردمان ، Kır-dı-man ) دەبینین هەمان بێ‌هێز لە بەرایی ڕاناوەکەشدا هات وەك کە لە پێش (ن)ی چاوگدا هات ، ئیتر هەمان پرسیار هەڵدەستێ لەوەدا ئایا ئەو بێ هێزە بەشێکی ڕاناوەکەیە ؟ خۆ زانیمان ناشێ بەشێکی فیعلەکە بێت ؟ یەك لا کردنی پرسیارەکە لە ئاست ڕاناودا کارێکی ئاسانە چونکە دەتوانین جێ‌گۆڕکێ بە ڕاناو بکەین وبزانین بێ‌هێزەکە چی لێ بەسەر دێت .

بابێنین پێشگری (هەڵ) بخەینە سەر فیعلەکە بۆ ئەوەی ڕاناوەکەی لێ‌بستێنێ : دەڵێین ( هەڵمان کرد ، hel-man Kırd ) . لێرەدا هیچ بەهێز و بێ‌هێز لە بەرایی راناوەکە دەرنەکەوت ، کەواتە بێ‌هێزەکە بەشێکی ئەویش نییە ئەدی‌چییە ؟

ڕاستی مەسەلەکە ئەوەیە کە ئەم بێ‌هێزە پێداویستێکی فۆنەتیکی ناچارییە کە لە هەندێ وشەدا دێتە دوای یەك لەدەنگەکانی وشەکە بۆ ئەوەی بتوانرێ تلفظی پێ‌بکرێ ، کە پێویستیش نەما بێ‌هێزەکە لەخۆوە دەڕەوێتەوە . ئێمە دیتمان لە فیعلی ( Kır-dı-man ) دا بێ‌هێزەکە هاتە دوای قەدی فیعل و بوو بە بەشی یەك لە بڕگەکانی ، بەڵام لەگەڵ پێشگری ( هەڵ ) ئەو ناچاری و پێویستییە نەما چونکە بە پێی داخوازی دەنگسازی کوردی وشەی وەك ( هەڵ ) لە بەرایی وشاندا پێویستی بەو بێ‌هێزە لکێنەرە نییە بەڵام کە ئاکە یەك دەنگی بەدوادا هات پێویستەکە پەیدا دەبێ . تۆ سەیری وشەی (بەد) هەرچەند وەك فیعلی (کرد) بە (د) کۆتایی دێت

چونکە لە کێشی (هەڵ)ە پێویستی بەو بێهێزە نییە لە بەرایی ڕاناوەکەدا وەك کە دەڵێی ( بەدمـــان کـــرد bed-man Kırd ) بەلام کە هاتی یەك تاکە دەنگت بەدوا ( هەڵ، بەد )دا هێنا ناچاریت بەو بێهێزە لکێنەرە لە یەکدیان ئاشنابکەیت وەك :

هەلم گرت — he-lım gırt

بەدم کرد — be-dım-kırd

تەنانەت حوکمی ئەو دەستوورەی دەنگسازییە وای کردوە بەشـێکی وشەی (هەڵ ، بەد) لەگەڵ ڕاناوەکەدا ببنە برگە و لە بەشی ســـــەرەتای وشەکان جودا ببنەوە .

یەك لە دەستوورە هەرە بەرچاوەکانی فۆنەتیکی کوردی ئەوەیە کە ئەگـــەر بزوێن بە دوا ئەو دەنگەدا هات کـــە بێهێزەکەی لە پێشدایە بێهێزەکە تێدەچێت وەك لەم نمـــــوونانەدا دەردەکەوێت :

وشەی ( گەنم ، ge-nım ) بە ناچاری ئەو بێهێزەی تێدا هاتوە تا مومکین بێ (م) کە بە دوا (ن)ەکەدا بێت ، بەلام کە هاتی بزوێنت خستە دوای(م)ەکە ئەو بێهێزە دەرەوێتەوە وەك کە دەڵێی :

گەنمـــەکە ، gen-meKe

هەروەها وشەی (کرم)یش کە ببو و بە ( کرمـان ) بێهێزەکـەی پاش (ر)ەکە تێدەچێت .

Kır-man — Kı-rim

هەرچـــەند ئێمـــە ناتوانـــین جێگۆڕکێ بە (ن)ی چاوگ بکەین بەلام دەتوانین وەك کارێکی بەدیهی چی لە ڕاناوەکان و وشەکانیدیکە بە دیاریدا ، بۆ (ن)ی چاوگی بکەین بە دەستوور چونکە ئەویش دەنگێکەوەك ئەوان .

بـــەلام لەگـــەڵ ئەوەشـــدا کـــە جێگـــۆڕکێ بـــۆ (ن)ی چاوگ مومکین نییـــە ، دەتوانـــین بێخەینە بەر دەستووری هاتنـــی بزوێن بۆ دوایەوە چونکە ، خوا و تالع ، پاشگر هەیە ئەم کارەمـــان بۆبکات :

دووفیعلی ( ڕستن کردن ) کە پاشگری (وە)یان بەدوادا هات باری ئەو بێ هێزەیان شلۆق دەبێ چونکە ئەوسا دەتوانی تێی ببەیت و بڵێیت :

best-newe

Kırd-newe

وەك هەست دەکەیت تێبردنـــی بـــێهێزەکـــە لە ( بەستنەوە ) دا خۆشترە ، کە ئەمەش هەر بڕیاری خزمایەتی نێوان دەنگەکانی کوردییە ، خۆ ئەگەر (ن)ەکە بـــە دوا (و)ی کۆنسننانتدا هاتبایە تێبردنی ئـەو بێهێزە دەبوو بە کارێکـی ناچاری وەك لەم نموونەیەدا دەدێتری :

وشەی ( کەون ، Ke-wın ) کە بێهێزەکەی تێدایە لە تەرکیبی خوارەوەدا بەتەواوی دەیدۆڕێنێت :

Kew-ne zam

فیعلی ( فرۆشتن ) لە هەنـــدێ بەکارهێنانـــــدا دەبێتە ( فرۆتن ) هەروەك کرۆشتن دەبێتە ( کرۆتن — لە شیعری مصطفی بەگـــی کوردی هاتوە ) جا ئەگەر بزوێنیان بخەینە کۆتاییەوە تێبردنی بێهێزەکە لـــە ( فرۆتن ،کرۆتن ) دا لەبارترە تـــا ( فرۆشتن ، کرۆشتن ) دیارە هەست کردنیش بـــەم ڕاستییە کــــاری سەلیقەیە :

fı-rot-ne-Ke

Kı-rot-ne-Ke

وشەی ( تووتن ) کە ئەویش وەك ( ڕستن ) دەنگی (ت) ەکەی کەوتۆتە پێش (ن)ەکەیەوە و ئەو بێهێزەشیان لە نێواندایە ، بێنە بزوێنی بدەیێ و سەیری بکە چـــۆن بێهێزەکـــەی دەرەوێتەوە :

toot-ne-Kem — too-tın

من لە نووسینی لێرەبەپێشەوەی خۆمدا ناوی ئەو بـــێهێزەم ناوە ( قورس کردن ــ قورسایی ) چونکە نە بزوێنی درێژە و نە کورتە [ واتە نە ئەلفە و نە واو نە یێ و نە کەسرە و نە فەتحە و نە بۆر ] نە دەشتەوێ بزوێن لەو شوێنەدا بەکار بهێنیت : ناچاریەکی دەربرینی دەنگی بێبزوێنە لە حاڵەتی تایبەتیـــدا ئەم قورس کردنە لەگەڵ خۆیدا دەهێنێ و هەرکە ناچاریەکەش نەما قورساییەکـــە تێدەچێ ، وەك ئەوەی پاسەوانـــی شەوانەی خانوو لەگەڵ گزنگی خۆر بۆی دەردەچێت و هەرگیزبە بەشێکی خانووەکە حیساب ناکرێ ، یاخـــود ساردی و گەرمی ئاو و هەوا بەشێکی پێکهێنەریان نین وەك کە ئۆکسـوجین بەشێکیانە .

ئەم دیاردەیـــەی قورسکردنـــی دەنگ و تێبردنی لە زمانی کوردیدا تا بڵێی بەکێشەیە بەلام کورد هەستی پێ ناکات چونکە بە سەلیقەی زگماك دەزانێ لە کـــوێ دەنگەکان قورس بکاتو چۆنیان ڕەها بکات کەچـــی بێگومان غەیری کورد زەحمەتی تێدا دەکێشێت و ڕەنگە هەر تێی بـــر نەکات . لە گوتارێکـــی خۆمـــدا ( فۆنەتیك چیمان بۆ بکا ؟ ) کە لە بەشی یەکەمی بەرگـــی ســـێیەمی (گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد — ١٩٧٥ ) دا بـــلاو کرایـــەوە مەبلەو بەدرێژی ئەم دیاردەیەم باس کردوە. لەو نووسینەدا ڕوونم کردۆتەوە کە دەنگەکانی زمانی کوردی لە ڕووی گونجان و حەز لەیەکدی کردنـــەوە چوار پلەیان هـــــەیە ، وا لێرەدا بەکورتی باسیان دەکەمەوە :

پلەی یەکەم : گونجانی تەواو . لەم

بلەبەدا دەنگەکان کە بەدوا یەکدیدا دێن قورس کردن هەڵناگرن وەك کە (د) بەدوا (ر)دا دێــــت وەیا (ت) دەکەوێتە پاش (س) و هی‌تریش :
gu-lıng , deng , shest , mast ,
merd , kurd , rend , mend
khurt, kert, khu-risht, gesht

پلەی دوەم : گونجان . لێـــرەدا دەشێ قورس کردن هەبێت و دەشێ نەبێت وەك دەنگەکانی ( ر ، گ ) ( ن ، ك ) :

be-rig , berg ( بەرگ )
de-nik , denk ( دەنك )

پلەی ســـێیەم : نەگونجـــان . بریتییە لەوەی کە پێویستە قورسایی بخرێتە سەر دەنگی پێشەوە وەك :

Ke-sir
He-le-dın
Che-shın

پلەی چوارەم : دژایەتی ئەویش نەهاتنی دەنگێکە بەدوا دەنگێکی‌دیکە مەگـــەر بزوێنی ئاشکرایان لـــە نێوانـــدابێت وەك ( ر ، ل ) و ( ل ، ر ) بە هەردوو شێوەی لاواز و قەڵەویانەوە و ( ق ، ك ــ ك ، ق ) و ( س ، ز ــ ز ، س ــ ش ، ز .. ) [ تەنها وشەی «سژ» م بەبیردا دێت کە «س» تێیدا هاتۆتە پێش «ژ» ی خزمی «ش» ]

زمانەوانو دەنگناســـی کوردی لەسەریەتی ئەم بەدیهیانە بەهەنـــد هەڵبگرێ وەك کە دێت دەستوورە ناسراوەکانی ڕێزمـــان و فۆنەتیـــك ئەزبەر دەکاتو دەیانلێتەوە ، هیچ لە بایەخی ئەم دیاردە گرنگەش کەم نابێتەوە بەوەدا کـــە جارێ بیری لێکۆڵەرەوەی کوردی بۆ نەچوە ئنجا کە ئێمە بێین ئەم دەســـتوورانە و دەستوورەکانی‌دیکەی (دەنـــگ)ی کوردی بەسەر پێك هاتنی چاوگی وەك ( ڕستن ، کردن دا ) بهێنین و یەکێـــك لـــە دەســـتوورەکانی وشەسازیشـی بدەینە پاڵ دەبینین لە بەر سێ هۆی زۆربنجی ڕێکـــە نییـــە بـــۆ تێبردنـــی نـــەو قورسایەی سەر ( ت ، د ) ی پێش (ن)ی چاوگ :

● یەکەم : (ن)ی چاوگ لە لاوە دێتە کۆتایی وشەکان ، بەپێی ئەوەی کە لە کوردیشدا دەنگی لاوەکی بـــە عادەت داخوازی قورس کردن لـــە دەنگی پێش خۆیەوە دەکات ، ناچارین دەبێ ئەو ( ت ، د ) ە قورس بکەین ، ئەم دەستوورەش هێنـــدە بەهێزە خۆی زاڵ دەکات بەسەر دەستووری ( پلەی گونجانی تەواو ) دا. بەنموونە وشەی کەس بدە بە کەسی دوەمی تاك ، کە ( ت ) ە ، دەبینی پێویستە قورسایی بخەیتە سەر ( س )ەکە هەرچەند دەنگی (س) لەپێش (ت)دا قورسایی قبوڵ ناکات : ke-sıt

وەك کە لە ڕستەی ( من کەسم نەدیتوە ، تۆ کەست دیتوە ؟ ) دا هەست بە قورس‌کردن دەکەیت لەو (س)ەی پێش (ت)دا بەڵام کە هاتی ( ت )ەکەت بزاوت خێرا قورسایەکە هەڵدەستێ وەك : kes-tan

( کەستان چۆتە شار ؟ )

ئەم دەستوورە بۆخۆی بەسە بۆ ئەوەی (ن)ی چاوگ بە هۆی ئـــەو قورس کردنە لە دەنگی پێش خۆی دابڕێت،بەڵام دوو دەستووری‌دیکەش پاڵپشتی لێ دەکەن کە دەبنە هـــۆی دوەم و سێیەم :

● دوەم : (ن)ی چاوگ بۆخۆی لە پلەی نەگونجاندایە لەگەڵ هەردوو دەنگی ( ت ، د ) . گونجانی (ن،د) لەو حاڵەتەدا دەبێ کە (ن)ەکـــە لە پێشەوە بێت لێرەدا (د)ەکە لـــە پشەوەیە ، هەروەها بـــە نیسبەت ( ت ، ن ) یشەوە. گونجانی (س،ت)و (ن،گ) و (ر،ت) یش هەموی هەر وەهایە ، کە جێگەی دەنگەکانت گۆڕی گونجانیان نامێنێ . بەو پێیە ئەگەر (ن)ی چاوگ لەلاوەش نەهاتبایە و بەشێکی پێك‌هێنەری ئەسلی وشەکە بایە هەر داخوازی ئەو بێ‌هێزەی دەکرد بۆ دەنگی پێش خۆی .

● سێیەم : ئەو دەنگانەی لـــە فیعلی کوردیـــدا دەکـــەونە پێش ( ت ، د ) ی کۆتایی فیملەکانەوە هەمویان لە پلەی گونجانی تەواودان لەگەڵ (ت،د)دا . دەنگی (د)ی چاوگی تەنها دوو دەنگی ( ر ، ن ) لـــە پێشیەوە دێن وەك :

کردن ، بردن ، خواردن ــ ستاندن ، کەندن ، خوێندن .. هتد . دەنگی (ت)ی چاوگیش دەنگەکانی ( ر ، س ، ش ، ف ، و ) لە پێشیەوە دێن وەك ( گرتن ، بەستن مشتن ، گلۆفتن ، کەوتن ــ مەبەست «و» ی کۆنسنانتە) . دەنگەکانی ( س ، ش ، ر ) گونجانیان لەگەڵیدا تـــەواوە دوو دەنگـــی ( و،ف ) یش وەك تەواو وەهـــان [ شەرحی ئەمە لێرەدا جێی نابێتەوە بە هەمـــە حاڵ گونجانیان لەگـــەڵ «ت»دا زۆر بەهێزترە لە گونجانی(ن) لەگەڵیدا ] . ئنجا کە حاڵ وەها بێ، ئەو (ن)ە چاوگییە کە لەلاوە بۆ وشە بێت و لەگەڵ کۆتایـــی وشەکەش نەگونجێت چۆن دەتوانێ گونجانـــی تەواوی پێش خۆی هەڵوەشێنێت ؟

بە سەرنج گرتن لە ( وشـــەی کوردی ) دەردەکەوێ ئەم دیاردەیەی گونجان و نەگونجانی ( دەنگەکانی کوردی ) لەگەڵ یەکدی‌دا هەروەك کاری کردۆتە سەر نەبوونی وشەی وەك ( کارل ، مێلرۆز .. ) دەخلی زۆریشی بوە بەسەر شێوە و شکلی گەلێك لە وشەکانی کوردی،بە نموونە

وشەی ( پلنگ ، pı-lıng
بلند bı-lınd هەرگیز
نەدەشیا
( pıl-nıg, bil-nıg )
بن چونکە خزمایەتی و گونجانی نێوان (ن ، گ) و (ن ، د) رێ نادات قورسایەکە بچێتە سەر (ن)ەکە ، کەچی وشەی ) فرتك ، fır-tık ) ئەو شێوەیەی وەرگرتوە کە پلنگ، بلند ) وەریان نەگرت چونکە دەنگی (ر) لە پێش (ت)دا قورسایی هەلناگرێ لەبەر ئەمە پێت ناکرێ بلێی ( fi-rıtk )
وشەکانی ( فرشتە fı-rısh-te
کەرستە ، ke-ris-te ) ش
ناشێ بکرێنە
( ker-sı-te ..... fır-shı-te )
چونکە گونجانی نێوان دەنگەکانی ( ش ، ت ــ س ، ت ) ناهێلێ لەو شوێنەدا قورسایی بچێتە سەر ( ش ، س ) . لە وشەی ( برشت ، bı-rısht ) دا سەرەرای ئەوەی کە ( ش ، ت ) لەلاوە هاتوە بۆ وشەکە ، گونجانیشیان لەگەل یەکدیدا تەواوە کە ناهێلێ بە قورس کردن لە یەکدی دابرێن ، ئنجا (ر،ش) یش لە پلەی نەگونجاندان.. کەواتە ئەم وشەیە هەر دەبێ ئەم شکلەی هەبێ .

بەراستی ئەم دیاردەیە لە کوردیدا کارێکی وەهای کردوە کە لە هەندێ زمانی‌دیکەدا نەی‌کردوە . لەعەرەبیداهەر بەجارێ هیچ‌بایەخێك بەو قورس کردنە نەدراوە ناشکرێ پێی بدرێ ، چونکە سەرلەبەرێ دارشتن و (صرف) و دەنگازی عەرەبی لەسەر تێنەخوێندنەوەی ئەو قورس کردنە هەلستاوە ، تەنانەت لە عەرەبیدا کورتە بزوێنی ( فتحە ، ضمە ، کسرە ) ش بایەخی دەنگەکانی دیکەیان نییە چونکە ، بەتایبەتی لە فیعلدا ، ئەو کورتە بزێنانە لە ( تصریف و اشتقاق ) دا دێن و دەرۆن و تێدەچن‌و و دەگۆرێن وەك ( قتل ، قتل ، قاتل ، استقتل ، یقتل ، مقاتلة ) ئەوەی ناگۆرێ و تێ ناچێ هەر دەنگەکۆنسانتەکانی(ق،ت،ل)ە. بزوێنە درێژەکانیش بەقەدەر کۆنسنانت هەمیشەیی و نەگۆراو نین بۆیە پێیان گوتون ( حروف العلة ) لە وشەی وەك ( علم ) کە چاوگە ئەو قورسایەی سەر (ل)ەکە نرخی نییە چونکە وشەکە دەبێ حەرەکەی بلرێتێ یا بە فەتحە یا بەکسرە یا بە ( ضمە ) هەرکە حەرەکەشی درایی قورسایەکە نامێنێ .

ئاختیوەری عەرەب لە ولاتێکەوە بۆ ولاتێك ، ماملەت گۆری لەگەل ئەو قورس کردنەدا دەکەن. میسریەکان، بە پێچەوانەی عیراقیەکان ، لەحەدبەدەر دژی قورس کردنن ، بە نموونە لە وشەی ( قلب «ئەلب» ، شمس ) دا هیچ قورسایی ناخەنە سەر ( ل ، م ) وەیاخود دێن ناوی ( جیمس بۆند ) دەکەنە ( جیمسی بۆند) تاکو (م)ی (جێمس) لەم قورس کردنە رەها بکەن ، کەچی عیراقی دەلێن (دەرووب ، گەلووب) لە جیاتی ( قلب، درب ) تەنانەت لە قسەکردندا (ر)ی پێش (د)یش قورس دەکەن ، بەپێچەوانەی کورد ، وەك کە دەلێن ( لتلیت الفرد «لیلة الفرد» fe-rıd ) ( فرید الاطرش ) چونکە بە ئەسل میسری نییە لە گۆرانی ( احلی همسە ) دا دەنگی (ش) لە وشەی (اشجان) وەها قورس دەکات بە درێژایی ئەلفێکی تەواو لە (ج)ەکەی دادەبرێ ، هەر هۆی ئەوتۆیش بوو وای کرد جارێکیان عەبدولوەهاب بلێ (فەرید ناتوانێ خۆی لە شامیەی رزگار بکات . لە کوردە واریشدا ماملەت گۆری لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دیکە لەگەل دەنگەکاندا دەکرێ . لە بەری بادینان هەندێ وشە هەن بە سکونی تەواو دەست پێ دەکەن ، واتە بێ‌قورس کردن ، کە ئەمە لە سۆران و باباندا مومکین نییە . دەوروبەری هەولێر پتر حەز لە قورس کردن دەکەن تا ولاتی کۆیە و سلێمانی و رانیە و سابلاغ ، تەنانەت ئەسلە هەولێری وشەیێکی وەك ( چی ) دەکەن بە (چ)ی قورس کراو .

لە ئینگلیزیدا ئەم قورس کردنە بایەخی پێ نەدراوە لە نووسینیشیاندا دەرناکەوێ هەر چەند بە پیتی لاتینیش دەنووسن . بەنموونە وشەی ( film ) ئەگەر بەپێی ئەو داخوازییە بنووسرێت کە بۆ ( رستن ، کردن ) کراوە دەبێ ( fi-lim ) بنووسرێت، بەلام دیارە لزوم نییە بەو قورس کردنە چونکە کە گوتت( filming ) قورسایەکە هەلدەستێ ، خۆ ناشکرێ یەك وشە بە دوو جۆر بنووسرێت نەخۆ هەرچی رێنووسی هەیە دەشێوێت . سەیرێکی رێنووسی ئینگلیزی بکەیت دەبینی لەوێدا ئەو بێ‌هێزە لە وشەی وەك ( sparrow , drill , try , snow , clean ) یشدا دەرناکەوێ هەرچەند هەمو دەنگەکانی پێشەوەشیان کەوتوونەتە پێش کۆنسنانت ، خۆ دیاریشە دەنگی سەرەتای وشە، کە بزوێنی ئاشکرای بەدوادا نەهات ، بەناچاری قورس دەکرێ . هیچ وشەیەکی ئینگلیزی نییە لەم جۆرە بێت و نیشانەی

قورس کردنی تێدا بنووسرێت .

له فارسیدا کێشەی قورس کردنی دەنگی پێش (ن)ی چاوگ بەوەدا هەڵستاوە کە فەتحەی خراوەتە سەرێ وەك : ڕەفتەن ، کەردەن ، ئاموختەن . . تەنانەت ئەم فەتحەیە لە وشەی ئیزافە کراو بۆ هەندێ ڕاناویش هەر بەکار دێت وەك : دەستەت ، نامەش ، پدەرەم . . جا ئەگەر بشڵێین لە کوریدا قورسایەکە پاشماوەیەکی ئەم بزوێنەیە هەر دادمان نادات چونکە هەرکە بزوێن نەما دەستوورەکانی دەنگسازی و وشەسازی خۆیان دەسەپێنن چ لەم کێشەیەدا بێت و چ لە شتێکی‌دیکەی سەر بە ئاخاوتندا بێ .

ئەم باسە گەلێکی بەبەرەوەیە ، هەم لە تەرکیبی ناوەکی وشە و ڕستەی کوردی و هەم لە ڕووی لێکۆڵینەوەی بەراوردی نێوان زمانانەوە ، بە تایبەتی چونکە هەر دەنگێك لە دەنگەکانی کوردی وەك ئەوەی لە زاری کوردەوە دێتە دەری، نەك لە زاری یەکێکی‌دیکە ، خاسیەتی خۆی هەیەو بە پێی ئەو خاسیەتەش حوکمی تایبەتی لە وشەسازی و دەنگسازی کوردی دەکات .

لە کۆتایی ئەم گۆتارە ناتەواوەدا دەڵێم : قورس کردنی کۆنسانتی پێش (ن)ی چاوگ بەشێکی بنجی وشەنییە ، نەهی فیعل و نەهی (ن)ەکە ، ناچاریەکی فۆنەتیکی دەیخاتە کۆتایی فیعلەکانەوە وەك کە دەیخاتە شوێنی‌دیکە لە هەزاران وشەی کوردیدا ، هەرکە ناچاریەکەش نەما قورسایەکە یا دەشێ هەڵستێ لە دەبێ هەڵستێ لەبەر ئەمە پێویست نییە لە جێگەی وەك ( ڕستن ، کردن ) دا نیشانەی بۆ دابندرێ چونکە نە لە وانداو نە لە شوێنی دیکەدا بەردەوام نییە و ئامانی بەسەردا دێت ، خۆ جایەزیش نییە نیشانە بۆ دەنگی نەبووی دابندرێ . هەرچونێك بێ دەبێ لە ئەمانیدا نیشانەکەی لابدرێ ئەخۆ ئاخاوتنی کوردی دوای بەینێك گۆڕانێکی گەورەی نارەوای بەسەردا دێت چونکە لەم سەردەمەدا ( زمان ) بە دائیمی دەخوێندرێتەوە ئیتر چۆنی بنووسیت وەهای لێ‌دێت بەتایبەتی چونکە لە سەدی نەوەدو پێنجی منداڵان دەچنە مەکتەب و ( نووسین ) دەخوێنن و دەڵێنەوە ، مامۆستاکانیشیان هەر ۱۰ — ۱۵ساڵێك دەتوانن لە گوتنەوەدا هەڵەی ناو نووسینەکە ڕاست بکەنەوە ، وردە وردە مامۆستا و قوتابی دەنووسن و دەڵێن

se-rı-man , si-pi-lım

bes-tı-ne-we بەستنەوە ، سپلم ، سەرمان ) . . تکا و ئامۆژگاری :

ئەگەر خوێنەرێك بە بیریدا هات ڕەخنە بگرێ لەوانەی گوتوومن ، وەك ئەوەی لە وشەی ( بریندار ، بەدکار ، بەرچنە ، بەرگر . . ) دا دوا پیتی ( برین ، بەد ، بەر . . ) قورس نەکران هەرچەند لە لاوەش ( . . دار، کار ، چنە ، گر . . )پێیانەوە نووساون با خێرایی نەکا لە بڕیاردان لەسەر هەڵە بوونی ئەو دەستووراتەی دەنگسازی و وشەسازی کە لەم گوتارەدا باسیان کراوە چونکە باوەڕم هەیە بەشی زۆری ڕەخنەکان وەرامی ڕێك پێکیان هەبێت ، بەداخەوە ئەم گوتارە بەشی ئەوەی نەکرد کە بەشی زۆری تێ‌بینی و بیروڕاکانی خۆشم بگرێتەوە . ●

---

**قوتابخانە میللیەکان هەنگاوی شۆڕشگێڕانەو جۆرێکی پەروەردەن شۆڕشی ۱۷ی تەمووز بۆ ڕۆڵەکانی بەدی هێناوون .**

# چەند سەرنجێکی ڕێزمانی دەربارەی

# لێکۆڵینەوەیەك لە سەر پاشگری «کە» ، لە زمانی کوردی دا

محمد احمد سعید

« لێکۆلینەوەیەك لە سەر پاشگری «کە» لـــە زمانی کوردیدا »

ئەگەر بێتو بەسـەرنجێکی وردو ڕێزمانییەوە لە زمانی کوردی بکۆڵینەوە ، دەرئەکەوێ کە زمانی کوردی زمانێکی فرەگرە . مەبەست لە فرەگریش ئەوەیە کە کۆمەڵی پێشگرو پاشگرو ناوگر هەن ئەچنە سـەر ووشـەکانی « وشـەی سادە ، لێکدراو » وشـەی تازە پێك ئەهێنن بە واتا پاشگر یا پێشگر بچێتـــە سـەر هەر وشـەیەکی سادە یان لێکدراو ، وشـەیەکی ئاڵۆز دروست ئەکات .

ئەمەش بەڵگەی ڕەسـەنێتی زمانـــی کوردیو یەکێکە لە خاسیەتەکانی کـە بووەتە هۆی دەوڵەمەند کردنی چ لە ڕوی زمانو چ لە ڕوی ڕێزمانەوە وە فراوان کردنیو زیاد کردنی وشـەکانی .

ئەم پاشگرانە یان پێشگرانە لە کاتی خۆیدا هەر یەکەیان وشـەیەکی واتا دارو پڕ مانا بووە . بەڵام بـە پێی دەورو زەمانو سووڕانی چــــەرخ گۆڕانیان بەســـەردا هاتووە . وە هـەندێ لـە دەنگـەکانیان تێ چووە . تا بەم جۆرە ماوونەتەوە کە لە ڕێزماندا بە زیادیەك ناو ئەبرێن . لە زۆر شوێن ئەرکـــی ڕێزمانیان هەیە . وەك :

هەڵ ، دا ، وەر ، ەوە ، «کە» ، ك ، ن ... تا دوایی ..

لەم چەندانەدا نووسینێك دەربارەی پاشــکری «کە» لە ژمارە «٥١» ی ساڵی ١٩٧٨ ی گۆڤـــاری ڕۆژی کوردستان دا لە لایەن کاك عبد القادر محمد امینەوە بڵاو کرایەوە . بە ناونیشانی ( لێکولینەوەیەك لە سەر پاشگری «کە» لە زمانی کوردی دا ) (١) جا لەم نووسینەدا منیش ئەمەوێ هەندێ سەرنج بخەمە ڕوو لەو بارەوە .

گەر بەو لێکولینەوەیەدا بچینەوەو بیخەینە بەر تیشکی لێکۆڵینەوەی ڕێزمانییەوەو بـــە وردی لێ‌ی بدوێین بۆمان دەر ئەکەوێ کە لە هەڵەو کەمو کورتی بەدەر نییە وە هەروەها ناوەڕۆکی وتارەکەش لە گەڵ ناونیشانەکەی دا ناگونجێ . چونکە لە زۆر شوێنیدا خۆی لە جەوهەری باسـەکە شاردووەتەوە چووەتە ناخی چەن باسێکی ترەوە باسی چەند ئامرازێکی وەك «ێك» بۆ نەناسراویی ناوە و «ەکە»ی بۆ ناسینی ناوو پاشکری « ك ، ik » ئەکات کە پەیوەندیان بـــە ووتارەکەوە نییە . سـەرەڕای ئەوەش بە شێوەیەکی زانستانە لێیان نەدوواوە و هەندێ کەمو کورتـــــی خستووەتە ناویەوە . کە ئەمەش بۆ باسێکی زمانەوانی وا ورد دەست نادات .

بێ‌گومان باسێکی ڕێزمانی وا ، لێکۆلینەوەیەکی زۆرو ووردو شارەزاییەکی تـــەواوو خۆ مانـــدوو کردنێکی باشی ئەوێ .

پێش ئەوەی بێمە سەر ئەوەی کە بابەتەکە هەڵەنگێنم و سەرنجەکانم بخەمە ڕوو . ئەمەوێ بڵێم کە ووتارەکە چەن خاڵێکی وای تیا هەیە شایانی ئەوەن بڵاو بکرێنەوەو جێگای ڕەخنە نین . بەڵام ئەوەی سەرباسی ئەم ووتارەیە مەبەستم ئەو هەڵانەیە کە کاك عبدالقادر ڕێی پێ نەبردووەو شایانی ئەوە نین کە وا بڵاو بکرێنەوە . با واز لەوەش بێنین و بێینەوە سەر سەرنجەکان

١ ــ کاك عبد القادر ئەنووسێ ، پاشگری « کە ، ك » لە زمانی کوردی دا کە یەکێکە لەو پاشگرانە کە دەبێتە هۆی دەوڵەمەند کردنی زمانە کەمان .

لێرەدا هەردویانی بە یەك پاشگر داوەتە نووسین لە کاتێکدا گەر وەکو پاشـــگر سەیریان بکەین جیاوازییان لە نێوان دا هەیە .. وەك

**دڕ + ك ــــ دڕك . « ك ، ik »**

**لووت + کە ــــ لووتکە . « کـە ، ke »**

٢ ــ لە باسی «کە» دا ئەنووسێ و ئەڵێ «کە» یەکێکە لەو پاشگرانە کە ناوی ناسراو دروست ئەکات وەکو ئەم ناوانە کچ ، کوڕ ، پیاو ، کچەکە ، کوڕەکە ، پیاوەکە ، بۆ دروست کردنی ناوی شوناسی «ناسراو» ئامرازی «ەکە» بەکار ئەهێنری اووتکە نەك پاشگری «کە» وەك لە نموونەکانی خۆی داو ئـــەم نموونانــەش دا دەرئەکەوێ :

**بەرخ + ەکە ــــ بەرخەکە**

**هەنار + ەکە ــــ هەنارەکە**

بەڵام لە هەندێ شوێن دا ئامرازەکـە وەکـو «کە» دیار ئەکەوێ بەتایبەتی ئەو ناوانەی کە بەدەنگی بزوێن کۆتاییان هاتووە وەك :

**وشە + ەکە ــــ وشەکە**

**مامۆستا + ەکە ــــ مامۆستاکە**

**دۆ + ەکە ــــ دۆکە**

**هەرمێ + ەکە ــــ هەرمێکە**

هـۆی ئەمـەش ئەگـەڕێتـەوە بۆ ئـەوەی کە دوو بزوێن تووشی یەك ئەبن بزوێنی کۆتایـی وشەکەو بزوێنی سەرەتای « ەکە » لەو نێوانەدا یەکێکیان تێ ئەچێ ، لە بزوێنە درێژەکـاندا وەك وشەکانی نموونەی دووەم و سێیەم و چوارەم بزوێنی سەرەتای « ەکە » تێ ئەچێ . چونکە نابێ دوو بزوێن بەدوای یەکدا بێن . جا بزوێنە درێژەکە وەك خۆی ئەمێنێتەوە. جاری واش هەیە بۆ ئەوەی هەردوو بزوێنەکە بپارێزرێ دەنگێکی نیمچــە بزوێن « ی ، y » ئەچێتە نێوانیانەوە . دەوری دەنگـی « کونسونانت ، نەبزوێن » ئەبینێ ، وەك :

**گا + ی + ەکە ــــ گایەکە**

**دۆ + ی + ەکە ــــ دۆیەکە**

لێرەشدا ئامرازی ناسراو شوناسی ئەبێتــە « یەکەی لە جیاتی « ەکە » یە .

٣ ــ هەر لە هەمان پەرەگراف دا باسی ئامرازی نەناسراوی کردووە کە لە ناونیشانەکەوە دوورە وە پەیوەندی بە پاشگری «کە» ەوە نی یـە . بـەڵکو ئامرازێکە ناو بەناوی نەناسزاو ئەکات وەك :

**بەرخ ــــ بەرخێك .**

نە « ەکە » ی ناسراو پاشگری « کە » یە . وە نە «ێك» پاشگرە وەکو نوسەر ئەڵێ بەڵکو هەردوویان ئامرازی ناسراوو نەناسراون .

٤ ــ دێتە سەر ئەوەی کە باسی دەوری «کە» بکات ، ئەوەی شایانی باس بێت لێرەدا وەکو پاشگر ئەدرێتە قەڵەم . بەڵام لە هەندێ شوێن دا بە تەواوی بۆی نەچووە . وەك ئەڵێ ناو لە ئاوەڵناو دروست ئەکات . ئەو مانایەی کە ناوی یەکەم هـــەیەتـی دەگۆڕێت بۆ ناوێکی تر وەك :

**پیس + کە ــــ پیسکە**

**جوان + کە ــــ جوانکە (٢)**

یەکەمیـــان جێی خـۆی نی یـــە چونکـە پیس خۆی ئاوەڵناوە وە پیسکەش هەر ئاوەڵناوە . جگە لەوەش کە ئەڵێ ئەو مانایەی کە ناوی یەکـــەم هەیەتی دەگۆڕێت . ئەویش هـەر هەڵەیە ئەبوایـە بینوسیبایە ئەو مانایەی کە ئاوەڵناوی یەکەمیان وشەی یەکەم هەیەتی دەگۆڕێت .

٥ ــ ناو لە فرمان دروست ناکات بەڵکو لە ڕەگی فرمان .

یان ڕەگی چاوگ . « کە » ئەچێتە سەر ڕەگی فرمان یا ڕەگی چاوگ ناو دروست ئەکات . فرمان و ڕەگ جیاوازن . فرمان نیشانەیە بۆ « کات ، دەم » دەربڕینی « کاتەکان » . بەڵام ڕەگ ناوکی چاوگە یان ڕەگی فرمانە . وەك ئەو نموونانـــەی کە خـــۆی هێناویەتیەوە .

٦ ــ ئەڵێت « کە » دەبێتە مەرج وە ئاوەڵکار وە ئامرازی پەیوەندی لە زمانی کوردیدا ، کۆمەڵێ نموونەی بۆ هێناوەتەوە . لە کاتێکدا لە هەموویاندا

هەر ئامرازی پەیوەندین لە ڕستەیەکی ئاڵۆزدا وەکو :

**ئەگەر تۆ نەڕۆیت منیش ناچم ، (( بۆ مەرج ))**
**تۆ کە هاتی من دەمنووسی ، (( ئاوەڵکار ))**
**نامەکەی کە تۆ هێنات من بردم ، ((ئامرازی پەیوەندی))**

هەرسێ ڕستەکە ئاڵۆزن وە خۆم بە ئەنقەست پاش و پێشیانم خست . بریتین لە دوو بەش یان دوو ڕستە . ئەو بەشەی کە ئامرازەکەی تیایە پێی ئەوترێ « لاڕستە » ئەوی تر « شاڕستە » ڕستەی سەرەکی .

لا ڕستەکەش وەسفی کردارەکە ئەکات کرداری ناو شاڕستەکە . وە ئامرازی « کە » ش پەیوەندی نێوانیان دەرئەخا ، بەلام ئەگەر ئێمەئامرازەکە دەر بهاوین ئایا مانای ڕستەکەئەگۆڕێ یا نەء وەکو :

تۆ نەڕۆیت منیش ناچم ،
تۆ هاتی من دەمنووسی
ئەو نامەیەی تۆ هێنات من بردم

لێرەدا مانای ڕستەکان نەگۆڕاون بەلام لە ڕوی پێکهاتنەوە گۆڕانیان بە سەردا هاتووەو بوونەتە ڕستەی لێکدراو بەلام لەوانەی پێشوودا ڕستەی ئاڵۆزن ...

٧ ــ لە باسی پاشگری « ك ، ik » دا لە هەندێ شوێن بە هەڵەدا چووە،وەکو لە خاڵی‌دووەمدا ئەڵێ ئەبێتە هۆی دروست کردنی ناو لە ناو بەلام لە هەندێ نموونەکانی دا بۆی نەچووە وەك

دڕ ـــ دڕك ، تەڕ ـــ تەڕك . (٣)

کە دڕو تەڕ هەردوکیان ئاوەڵناون نەك ناو . دڕ بۆ سەگی هار یان یەکێکی بێ حەیا بەکار ئەهێنرێ یاخود بە شتێ ئەوترێ کە زبر بێت . وە «تەڕ» ئاوەڵناوە ئەبوایە لە خاڵی سێیەمدا باسی بکردایە .

٨ ــ بێینەوە سەر ناونیشـــانی ووتارەکـــەو ناوەڕۆکی ئەبینین جیاوازییەکی زۆریان لە نێوان‌دا هەیە . ناونیشانەکە دەربارەی پاشگری «کە» یە . ناوەڕۆکەکەش باسی ئامرازی «ەکـــە» ، «ێك»ی ناسراوو نەناسراوە . بەوەوە نەوەستاوە چووە لە جیاتی ئامرازی «ەکە» پاشگری «کە»ی نووسیوە کە ئەمەش ناچێتە چوار چێوەی باسی ڕێزمانیەوە وە هەروەها پاشگری «کە»ی بۆ ئامرازی پەیوەندی بەکار هێناوە کە گوایە ئەو دەورە ئەبینێ .

پاشگری «کە» وەکو پاشگر سەیر ئەکـــرێ و ئەچێتە سەر ناو ، ئاوەڵناو یا ڕەگی چاوگ « ڕەگی فرمان » تادوایی .

ئەبێتە هۆی گۆڕینیان چ لە ڕوی مانا و چ لـــە ڕوی پێکهاتنەوە .

وەك

**ناوی سادە لووت ـــ لووتکە**
**ئاوەڵناو پیس ـــ ـپیسکە ـ ترش ـــ ترشکە**
**ڕەگی فرمان فڕ ـــ فڕکە**

بەلام بەکار هێنانەکانی تری «کە» هەمـــووی هەڵەن چونکە هیچیان پاشگر نین بەڵکو ئامرازن و دەوری خۆیان هەیە بەپێی ڕستەو شوێنی ڕێزمانیان کە لە پێشەوە باس کرا .

وە هەروەها ئەمەوێ ئەوە بخەمە ڕوو کـــە پاشگری «ك» لە بنەڕەت‌دا تەنها ئەو دەنگە نی‌یە بەڵکو بزوێنێکی کورتیشی لە گەڵـــدایـــە وەك « ik » هەرچەندە ئەمەش لە ڕێنووسی کوردی‌دا دیـــار ناکەوێ چونکە نووسینی کوردی بە « ئەلف و بێ » ی عەرەبی ئەنووسرێ . وە تائێستـــا ئـــەم دەنگـــە نیشانەی بۆ دانەنراوە وەك لە وشەی « دڵ ، Dil » « پڕ ، Pir » دا دەر ئەکەوێ .

لە کۆتایی‌دا هیوا دارم کە بەم وتارە ســـودێکم گەیاندبێ ...

### سەرچاوەکان

(١) گۆڤاری ڕۆژی کوردستان ژمارە (٥١) سالی ١٩٧٨ لاپەڕە «٥٦»

(٢) کە باسی ڕەگی فرمان کراوە . لەم ڕووەوە سەرنجێکم هەیە کە نوسەری وتار فەرامۆشی کردووە ئەویش ئەوەیە کە «کە» خۆی ڕەگـــی فرمانە یاخود ڕەگی چاووگە « کردن » وەك لەم ڕستەیەدا

من ئەم تاقی کردنەوەیە ئەکەم

(٣) گۆڤاری ڕۆژی کوردستان ژمارە «٥١» سالی ١٩٧٨ لاپەڕە «٥٧» ●

# گەرانی بوون ...

رەئووفی ئەحمەد ئالانی

**له دەربازگەی بڕوامەوە ـ بەزمانی یەکگرتوی ئەدەبیی کوردی ـ جاربەجارێ هەڵەی باو دەخەمە بەرچاو ... کاتێ ساماڵی زمانی نووسین دەردەکەوێ کە ـ بۆ پێفێربوونو پێفێرکردنی ، لەژێر ڕکێفی دەستووری دابینکەردابێ ، دەنا لە وزەی دوو توێیی هیچ کتێبێکدا نیە ، ئەوەی سەرجەمی خەڵکی ـ لەکاری ڕۆژانەیاندا ـ قسەی پێدەکەن، بەگرامەرێکی گونجاو بکرێتە خوانی بەردەمی ـ مەردومکەلەکە ،**

بڕوام وایە کە زۆر دەقەزمانـــی لەئاخاتنـــدا بەحەلاڵی دەقۆزێنەوە ، بەڵام لەنووسیندا حەرامن کارم بەو نووسەرانەوە نیە کە بەهەڵەی خۆیانـــدا ناچنەوەو بەناوی سەلیقەســـازی ، چیان بـــەدەم خۆش بێ ئاواشی دابڕێژن .

ئەگەرچی لێکۆڵینەوەکەم لایەنێکی زانستانەیە ، بەنارەوای نازانم کەئەم کولـــە ســـەرگوزەشتەیەی تێچێن بکەم : منداڵ بووم و ـ لە گوندەکەی جارانمان ـ بۆیان دەگێرامەوە : ـ

« بەنجاوشەش ساڵێك لەمەوبەر ، ئاغایـــەك چەرچیەك ڕووتدەکاتەوە ، لەنێو وردەواڵەکەیـــدا گوزمەیەك ڕەحەتەلقوومی تێدا دەبـــێ ، ئاغامـــان مەرحەمەت لەگەڵ سۆفیعەلی ناوێك دەکاو چەنـــد دانەیەکی لێدەداتێ ، ئەویش لەبەر بەربەرۆژکـــە دەیانگلمێنێ . مسکێنێك پێیدەڵێ : سۆفی ! خۆت دزانیی کەئەو شەکرۆکانە زەوتەنیو حەرامن ؟!.. ئەویش هەر ئەوەندە دەڵێ : ـ بەخوا .. بەزاریم ڕەحەتن ... » .

لارەدەنگیو بڕگەسوانەوە لەزمانی قـــەداو ناوچە بەناوچەو خێڵ بەخێڵ ، دیاردەیەکی ئاساین . بەو بەرڕەهایە لەنووسیندا تاوانادرێن ، بێتو ئـــەو هەرمەکاریە بچڕێتـــە زمانـــی نووسینیشـــەوە خۆخەریككردن بەدەستوورسازیی زمانەوەکارێکـــی بێهوودەیە .. لەلایەکی دیکـــەوە خۆدزینەوەیـــە لەتەقەلادان بۆ یەکێتیی زمانو نەتەوە !!

لافی ئەوە لێنادەم کە ڕەمەکینووس نەبووبم .. یان نەبم . دەمـــەوێ بەرلـــەوەیکە بە هەڵـــەی ئەمونـــەودا بچمەوە لـــەگیروگازی خۆمـــەوە دەستپێبکەمو بەقـــەی ئەزۆك گەمە بە زەینـــی کەس نەکەم ، ئەگینا فتوای حەرامگۆی وام کەوتوەتە بەرچاو کە لە « حرف جرر »
فعلی سازاندوە ! ئەمەش هەر لە زمانەوانی کـــورد ڕووی داوە !؟

## گەردانێك بە چاوگی ـ بوون ـ :

ئەو چاوگە لەتوخمـــی کارە یاریدەدەرەکانەو بێهێزو تێنەپەڕە ... بە قەدو ڕەگیەوە دەکەوێتە گەردان ، وەك [ بوو ، دەبێ ، ببە ... هتد ]
لە وشەلکێنیدا « الالصاقیە » کە دیاردەیەکی هەرەزاڵی زمانەکەمانە ـ دەورێکی بەتەوژمی هەیە ، بەچەشنی کاری « کردن » کە ئەمیان تێپەڕە .
نموونەی لکێن ، وەك : ـ ئاوابوون ، سواربوون، بووە .. زۆربوو ... هتد گیروگرفتیان کەمەو پێیان دەگوترێ ـ چاوگی دەستکرد ـ .
لەحەلێکدا قەدی [ بوون ] بـــە مۆرفێمەوە گەردان ، ڕەتبـــلاودەبێ ، لەشێکردنــــەوەدا سەختگیردەبێ ، بەتایبەتی لەزمانی نووسیندا .

### ١ ـ بوو ـــ لە بەر کێشی ـ چوو :

کاری ڕابووردووی ڕەبەقەو قەدی چاوگی ـ بوون ـ ە ، بەکرتاندنی دەنگی ـ ن ـ . لەهەمان دۆخداو لە ئاخاوتنـــی گۆمیـــانو کرمانجـــی سەرووودا ـــ ئەو درێژە بزوینە [ .. وو ] لەسەر ئاهەنگی تورکی بە دوواۆ = دیفتۆنگ دەشکێتەوە ، واتە
دەنگ + تێکرای ـ
iu

ـ ئەبوو ـــــ لەدۆخی نەفیدا . لەگۆرانیو ئەردەڵانیدا ، دەبێتەوە بە [ ئەوو ] بەگۆڕینی دەنگی / ب / بە دەنگی / و / . ئەرهەنگی مەردۆخ ـ ل ٤ـ بەرگی یەکەم ـ دەڵێ : ـ

« لەم دنیای خەما منی شەیدائی +
چاوێکم کردەو لەبۆ بینائی ....
هەرچەنم کۆشا کەس خەوەرەو ( ئەوو ) +
لە تەنیائیبیا فیچ چوومە خەو . »

### ٢ ـ دەبوو ـــ وەك ـ دەچوو :

پێكهاتوە لە نیشانەی [ دە = ئە + قەدی بوو ] ڕابووردووی بەردەوامیە . باری ئیلزامیش دەگرێتە خۆی ، کە دەڵێن : [ دەبوو بمکردایە ] لەو ڕێژگە = صیغە ـ یەدا ، پێویستە ڕاستبکرێتەوە ، پاشکۆی [ ایە ] بەهامبەر وەربگرێو بنووسرێ « دەبوایـــە بمکردایە » لەهەندێ ناوچەدا ، دگوترێ : « دەبـــوا بمکردایە»بەهەرحاڵ بێتو بەوچەند شێوەیە بخرێتەکار قالبێکی هاوبەش بەناڕەوا دێتە گۆڕێو دەبێتە مایەی ئالۆزکان .

### ٣ ـ ببوایە ـــ کاری ڕابووردووی دانانیو مەرجی :

پێكهاتووە لە نیشانەی [ ب + قەدی بوو + پاشکۆی ـ ایە . بەهاوکێشەی بنووستایە ) . ئەم ڕێژگەیە وردبینی تێدادەکرێ :
أ ـ دوو بزوێنی / .. وو + .. ا / لێکیان داوەو گۆکردنیان مەحاڵە !
ب ـ بەهاوکێشەی/.. وو ، و+ی+بزوێن= / و / ی دەنگ + بزوێن ، دەبێتە ( ببوایە Bibwaye هەندێ زمانەوان لە تێڕوانینی جووتـــە واوەکەوە ، دەهێنن بزوێنی / .. و = u /دوولەتدەکەن، بەم گەمەکاریە بڕگەی لێسازدەدەن :
ب / بو / وا / یە = Bibu waye
ج ـ سازدانی نێوبڕ بەدەنگدار لەنێوانی جووتە بزوێندا ، بۆ ئەوەیکە هیچیان فەرامۆش نەکرێن : ( ببوو + ـ ب + ایە = ببوویایە ) لەشێوە ئاخاوتنی سلێمانیدا ئەو پاراستنە زاڵە . وێنەی تێچوونو تێنەچونشمان زۆرە ، وەك : ـ گا + ەکە = گاکە ، یان گایەکە
لەدەســـتە شێوە سۆرانـــیدا ، ڕابووردووی دانانی = انشائی ، بەم شێوەیەیە :

**أ ـ بـ+ب+ایە= ببایە . واتە بزوێنی قەدی ـ بوو ـ بەتەواوی تێدادەچێو تەنها ڕەگـــــی / ب / لەکارەکەدا ، دەمێنێتەوە ، ئەم ڕێژگەیـــە چونکـــە دیاردەی دەستەشـــێوەیەکە ، بەهەڵە دانانرێ ..**

بەڵام چونکە قەدی کارەکە ـ بوو ـ ەو تێچوونـــی بزوێنەکەی لەباری ناچاریەوەنیە ـــ ڕێژگەی ـ ببوایە ـ پەسند دەکرێ لەنووسیندا .

**ب ـ ئەگەر لە ببایەدا دەنگی / ب / ی دووەم بەرەگەکار خۆی ساغبکاتـــەوە ، دەبێ لـــەوێنەی ـ بخوادبایە ـ دا بە چیدابنرێ ؟**

لەوبارەیەوە هەندێ زمانەوان ـ وەك مامۆستا مەسعوود محەمەد ـ لە لێکۆڵینەوەکانی خۆیدا ، وەك پاشگر بەرەسەنتری دادەنێ ، واتە پەنجە بۆ وێنەی ـ بکردبایە ـ ڕادەکێشێ .
لەبۆچوونی خۆمەوە ڕامجیـــاوازە ، گومانـــی تێدانیە کە ( ایە ) پاشکـــۆی کاری ڕابـــووردووی

دانانیە : ( بـ .... ایـە ) دەمێنێتەوە پسانەوەو نەپسانەوەی تێکڕای نیشانەی ( بایە ) ژێربێژیانە بۆیدابچین لە سۆرانیدا ڕێژگەکە بەم چەشنەیە : بووبایە ؛ کردبایە ... لەم دۆخەدا تێکڕای نیشانەکە بریتیە لە ( بایە ) بە نەپساوەیش دەلکێ بەکۆتایی کارەکەوە .

کە لە بڕێ ئاخاوتنیشدا دەگرترێ :

بکردبایە ، بدابایە ... وایبۆدەچم کە لە تێکەڵبوونی دووشێوەوە پەیدابووبێ ، واتە بەڕایی نیشانەکە لە بابانیدا شاربازێری ـ خۆی ڕاگۆیزکردبی بۆ سۆرانیو تێکڕای [ بـ ... بایە ] هاتێتە کایەوە ، لەم کارتێکرانەوە وێنەمان زۆرە وەك ئامرازی پەیوەندی ( لەبۆ = لۆ + بۆ )

بەسەرنجدانی ئەدەبیاتی ناوچەی سلێمانی لەبەرهەمی شاعیرە پێشینەکان زەق بوونەوەی ( لەبۆ ) مان بۆ دەردەکەوێ ، ئەم کارتێکرانەش ڕەوتێکی مێژوویيە لەگشت زمانێکدا . ئەو نەپسانەوەیە ـ بەچاو مۆرفیمەکە ـ لە دەستەشێوەی سۆراندا ، لەبارترە . بەڵام لە دۆخی نەفیو ئیسپاتدا بەدەست جێگۆڕکێی ڕاناوی چالاك ـ ضمیر متصل ـ ەوە گیردەخۆین بەڵام لەئاخاوتنە بابانیەکەدا یەكڕەتدەبێو پاشوپێش ناکا ، وەك :

أ ـ بابانی : ـ بمکردایە ، نەمکردایە

ب ـ سۆرانی : ـ کردبامایە ، نەمکردبایە .

ئنجا بۆ ئەوەیکە تووشی ئەم هەموو گێرمەو کێشەیە نەبینو بەخواستی زمانی نووسین تەنها قالبێکیان لێبخرێتەکار ،

**٤ ـ بووبوو ـــ کاریڕابووردووی دوور :**

پێكهاتوە بە دووبارەخۆی کارەکە ، وەك دەردەکەوێ قالبەکە ـ بوو + بوو ـ لە ئاخاوتنی سلێمانیدا بە کاملی گۆدەکرێ. بەڵام لە دەستەشێوەی موکریدا، کارە بنجیەکە لە بڕگەی کراوەوە دەشکێتەوە بۆ بڕگەی گیر ، کە بزوێنەکەی بە پیتی عەرەبی نانووسرێ ، وەك ئەم شیکردنەوەیە :

« ب / = بوو + بوو = ببوو = Bibu »

ئەم قالبە تێكشکاوە لەزمانی قسەداو لەزۆر هەریمدا زاڵە و نووسەرانیش لە ئەدەبیاتی تۆمارکراویاندا بەکاریدەهێنن ، بەشبەخۆم ئەگەر لەقسەدا وەهام دەقپێوەگرتبێ ، لەنووسیندا کردەپەشیمانم ، مەبەستم ئەوە یە کە بەخواستی وشەسازی دەستچنی دەقە زمانیەکان بکەینو ڕێگەی ئاسان بدۆزینەوە لە دەستوورسازیدا .

**٥ ـ بووە ـــ کاری ڕابووردووی نزیکەو**

لەسەر کێشی ـ چووە : پێكهاتوە لە :

( بوو + وە ) . لەسەر فۆرمی نیشانەی ڕابووردووی نزیك کێشەو دەمەقاڵی بەردەوامە ،

أ ـ ڕابووردووی ڕەبەق + نیشانەی ـ وە ـ . بەپێی لێکۆڵینەوەکانی خۆم بڕوام بەم لایەنەیە .

ب ـ ڕێژگە بنجیەکە ئاوەڵ ناوە و دەنگی / وو / ی درێژ پاشگرە ، نیشانەکەش تەنها بریتیە لە / ..ە / ی بزوێن ، ئنجا ئەویش ڕاناو بێ یان کاری یاریدەدەربێ ..

ج ـ ڕایسێیەم : نیشانەکە بەدوای دەنگداردا / وو / ی ڕووتە ، وەك ـ ڕشت + وو ـ بەدوای بزوێنیشەوەتەنها / ـ و / یە ، وەك :

ـ زانی + و ـ ئەمەیەرەیە ساکارانە بۆی چوونو هیمایان بۆ بزوێنی / ..ە / نەکردوە .

تێبینی : لە کتێبە دەستنووسەکەمدا : ( قریوەیەك لەچوار وەرزەی زمانی کوردیدا ) ئەو لایەنانەم یەکلاکردونەوەو لێرەدا بواری پەلپێهاویشتنم نیە .

**ـ کاری ( بوو = وە ) لە نێوان زمانی نووسینو قسەدا ، ئاڵۆزکاوەو بەگشتی نووسەران ئاوڕێکیان لە لایەنە زانستیەکەی نەداوەتەوە ،**

أ ـ لەڕووی دەنگسازیە وە ، ڕێکە لەوە نەگیراوە کە بڕگەی ـ بوو ـ بە درێژەبۆر = ضمە طویلە ـ سوار بڕگەی ـ وە ـ بێو بگوترێ : ( بوو وە )

بەڵام لەدەرپۆقاندنی لچولیوو بێبوارە بەدوا یەکداهاتنی ئەو دوو بڕگەتەنافیە ، قورسی پەیدا دەبێو بڕگەی یەکەم کورت. هەڵدێتەوەو زیان بە ساختمانی وشەکەش ناگا ، کە بنووسرێ :

ـ بو وە ـ نەك بنووسرێ : ـ بوو وە ـ .

ب ـ لە ڕستەسازیدا بەدوای کاری ـ بووەدا ئامرازی پەیوەندی / ..ە / بەرەنگاری بزوێنی نیشانەکە دەبێ ، دیارە دەبێتە ـ ە + ە ـ گۆکردنیان بەیەکەوە مەحاڵە . بۆ پارستنیان نێوبڕ = ئینفۆنیکی / ت / دێتەکایەوەو دەبێژرێ : [ بو + وە + ت + ە ـ پیاو ] لە زمانی قسەداو بۆ بارسووکیی

لچولێو ، ئەو ساختمانە هەرەس دەهێنێ‌و کالــــی بێ‌خەبنە ژێر ڕکێفی شێ‌کردنەوەوە بـــەدەستیەوە گیردەخۆن ، وەك بڵێین : ـ ڕەگی / ـ ب = بوو . وو + وە = ۆ ـ . لێرەدا قەدی کارەکەو فۆرمــــی نیشانەی ـ وە ـ لە تاکە بڕگەی بۆ ـ دا ، سەری تێدا دەچێ . لەگەڵ ئەوەشدا کە ڕێکە لە قاڵبە کاملەکە نەگیراوە . کەواتە ڕەوای‌کارنیە کە لەباتی (بووەتە..) بنووسرێ ( بۆتە ... ) .

ج ـ دیسان هەر لەوشەسازیدا کاری ـ بوو ـ لەگەڵ پاشگری / ەوە / ی دووبارەو بەرەبەرەدا ، لە گرێژنە دەچێ ، بەنیگایەك ئەم ڕێژگانە گـــەماروی زەنیمان دەدەن :

١ ـ بو / وە / وە = بووەوە
٢ ـ ب / وە / وە / = بوەوە
٣ ـ بۆ / وە = بۆوە .

باری‌زانستو سەردەمی تیژەڕو ، تەنها ماوە بەوە دەدا کە ڕێژگەکە لە دەقی ( بوەوە ) دا خۆی بچەسپێنیتە نووسینەوە ، چونکە قاڵبی ـ بۆوە ـ وەك ( ـ بۆتەوە ، چۆتەوە ) کە لە مەوبەر لەسەری ڕۆیشتم بەجارێ سەریان تێدادەچێ . قاڵبـــی ( بووەوە ) ش زێدەرەوی تێداهـــەیە ، چونکـــە درێژەبزوێنی / .. وو / ی دوای ـ بوو ـ بەزەبری بزوێنەکەی دی دەبێتەوە بەدەنگدارو سەرەتـــای بڕگە ودەنگی / ب / وەك بڕگەیەکی گیر بەجێ‌دەهێڵێ، نیمچە بۆری / .. و / یان نیمچە ژیری ـ i ـ لەم ئەلفوبێیەدا هیمایان بۆ دانەنراوە ، وەك لەوشەی ( چیا ، چوار ) دا هەستیان پێ‌دەکرێ‌و نانووسرێ ( چییا ، چووار ) .
بەخواستی ئەو لێ‌کۆڵینەوەیە وەها پێ‌ویستە کە

**بنوسین**

بوەوە = Biwewe

. . . . . . . . . .

بووەتە ..

**نەنووسین**

بووەوە

بۆوە

بۆتە ...

بوووەتە ..

بوەتە ..




شانۆگەری‌ی ( ژان ) لەســـێ بەشدایەو، لە نووسینی‌ی نووسەری لاو کاك فەهمی کاکەیە . ئـــەم شانۆگەریەش نۆبەرەی بەرهەمــی‌ی کاك فەهمیەو یەکەم شانۆگەریەتـی کە دەکەوێتە بەردەست خوێنەرانی‌ی کورد .

کات لە شانۆگەریەگەدا مەودای کەمەو تەنها نزیکەی شەوو ڕۆژێك دەخایەنێت،ڕووداوی شانۆگەریەکەو هەڵس و کەوتـــی کەسانـــی شانۆگەریەکە لە کۆلانێکی کۆنـــی پێش نەکـــەوتـــو ڕوودەدات .. دەتوانین بڵێـــین نووســـەر زۆر بەوەستایانە وێنەی پاڵەوانەکانـــی شانۆگەریەکەی کێشاوەو ( کـــالا

بەگوێرەی بالا ) خستوویانیەتە ڕووو دابانی ناوە ، بۆ نموونە کە دەبینین فاتە ڕەش ژنی عەزە سمێلە وەکە دەبینین حەمە سالح گۆشت برژێنەو گوزەرانی خۆی بــەو پیشــەیە دەباتەسەرو لەهەمان کاتیشدا وەك نابن پەروەرتێك و ڕێز لێ گرتکـــی نەریتی باوو کۆن خۆی دەنوێنێت . وەیاخود دەروانینە کە سایەتی قالە لەشانۆگەریەکەدا ، دەبینین قالــە باوکەو قومار باشیشەو عــەرەق خۆریشە ، بێگومان عەرەق خۆری هەمیشەییش هەردەم سەرخۆشەو خاوەن خۆبشی نیەو ئاگاداریش نیە ، وەقومار چی باشیــش سەرکەوتن و داکەوتنی دەکەوێتە سەر ڕێکەوتی کوێرانە ، لەبەر ئەوەی قومار چـــی لەکاتی یاری کردندا لەسەر مێزی سەوز ، خۆی تاقی دەکاتەوە بەبێ ئەوەی پشت بەتیۆرێکی تایبەتــی بەبەستێت یاخــود ڕەچــاوی ڕێرویکی دەسنیشان کراو بکات .

لەبەشی یەکەمــــدا قالــە دەگەڕێتەوە بۆمالی خۆیان بــەلام مالی نادۆزێتەوەئەلەبەر ئەوەی خاوەن خانو نیەو کرێچیە ، وەیاخود کەوەك لەلاپەڕەی (٦)دا بەســر زمانــی خۆیەوە هاتووە کەدەلێ : « چونکە دەرگاکان هەموو لەیەك ئەچن .. هەمووشـــیان بەدیوی نـــاوەوە دەکرێنەوە » وەك لەم ووتەیەی قالە دەردەکەوێت هەمــوو مالەکانـــی کۆلانەکە لەیەك ئاستدا دەژیــن و هەمووشیان چوونەتــە نێــو خۆیانەوەو دەرگاکانیان **بەرەو ڕووی دەرەو ناخرێنە ســــەرپشت . ؟**

قالە لەمالی عەزەسمێل کرێچیە ؛ بۆشەو هەرکەدەگاتە بەر دەرگـــاو ناگات هەموو شتو مەکەکانیـــان لەلایەن مالی فاتەوە فڕێ دەدرێنە دەرەوە بۆ نێوەڕاستی کۆلانەکە . بەوشـەوە قالەو کچەکەی و هەردوو کوڕەکەی دەر دەکرێن . حەمـــە سالحی دراوسێی عەزەسمێــل و فاتەڕەش ناحەزیەکی دوورو درێژی هەمیشەیی هەیەلەگەل مالــــی عەزەدا، بۆیە ئەویش یانی حەمەسالح گفــت بەمالــی قالــە دەدات کەژوورێکیان بداتێ . بەلام گفتەکەی ناباتە سەرو دەرگای ئـــەو ژوورە داخراوەیان بۆ ناکاتەوە کەدەبێــت بیانداتــێ مالی قالــە تارادەیەك شارەزاییان هەیە دەربارەی حەمە سالح و ڕابردووی لەکۆلانەکەدا، بەلام ناچارەو پــــەنا دەبەنـــە بەری و دەچنە مالیان . ئەم پەنا بردنەیش وەك پەنا بردنەکەی دکتۆر(فاوست)ی پیرە مێردی **شانۆگــەریەکــــەی (فاوست)ی (گۆتە)ی نووســـەری ئەلەمانی وایە** . دکتۆر فاوســت خۆی و گیانی خۆی دەخاتە ژێــر ڕکێفی شەیتان و خـــۆی پـــێ دەبەخشێت ، دوای ئەوەی شەیتان بەجوانی و ڕاپواردن و پێ‌گەیشتنی مەبەست ، فاوست هەلدەخڕێنێ و لەخشتەی دەبات . لەئاکامیشـــدا فاوست هەموو شتێك لەدەســت دەدات . حەمە سالحیش بەزمانــی لووس وەك شەیتان قالە هەلــدە خەلەتێنێت و دەیخاتە سەر ساجی عەلی . فەرمانی کوڕی قالە هەرکە تەمەن چواردە سالە بــەلام بڕوای بەگفت و قسەکانی حەمە سالــح نیە ، بەلام بلی چی گەر ئەو لەژێــر ڕکێفی باوکیدایە ..

مالی قالە هەرگیز لەمالی حەمە سالحدا ئاسوودەگی نابینن و پەلاریان تێ دەگیرێت لەلایەن مالی فاتەوە . وەهەروەها حەمە سالحیش چــاو دەبڕێتە ئەسرینی کچی قالـــەو




دەرگای ژوورە داخراوە کەیشیان بۆ ناکاتەوە ، فاتەیش لەو دیوەوە تاو نەتاوێك دەنگی بلند دەکاتـــەوەو قسەیان بۆ تێ دەگرێت ، لەلایەکی تریشەوە کۆمەلێـــك لەمنـــدالان لەکۆلانەکەدا هان دەدا و فیتیان دەدا تاقسەی هەلبەستراو ئاراستــەی مالی قالەبکەن .

ناکۆکی و ناحەزی سەختی نێوان مالی عەزەو حەمە سالح دەبێتـــە هۆی ئەوەی کە حەمەسالح دالدەی مالی مام قالە بدات و بیانگرێتە خۆی بەپێی ئەو پەندەی کە دەلێـــت « دووژمنی دووژمنم دۆستمە » گەر ئەم پەندە لێرەدا بەتەواوەتی بشێت. ناحەزی بەردەوامی نێوان مالـــی عەزەو حەمە سالح لەشانۆگەریەکەدا دەسنیشــــان کراوەوەك لەلاپەرەی (٤٣)دا لەسەر زمانی فاتەڕەشەوە هاتووە کەدەلێت « ئێرەتان باشترە ؟ ئاخر ئێوە نازانن حەمەسالح بەئەمای چیە ..؟ ئەوە سەر سەری بە .. سەرسەری .. ئەمە چەند ســـالە داوای کچەکەم ئەکات و نایدەمێ ..

ئەویش ئێستا لەرقی ئێمە دالدەی داون .. » ئەو کچەی کەفاتە دەڵێ گوایە کچی ئەوەو حەمە سالحیش داوای دەکات ، ئایا دەبێ ئەو کچە کچی شەرعیی کێبێت ؟ وەئایا دەبێ قالە تابۆی ڕەشیی پارچە زەویەکی نەبێت لەنێوان ماڵی عەزەو ماڵی حەمە سالحدا ؟

عەزەو حەمە سالح وەك نموونەی دووکەسیی سەر بەچینیبرژوایمام ناوەندی ، هەست بەبەرژەوەندیی یەکتر دەکەنو دەستی هاتنو ڕێك کەوتن بۆ یەکتر درێژ دەکەنو بۆ ماوەیەکی کەم ناکۆکیەکانی خۆیان لەنێو دەبەنو ، گوایە کچەکەی فاتە بەحەمە سالح دەدرێت .. ئەمە لەلایەکەوە لەلایەکی تریشەوە مام عەلیی برای قالە بۆشار دێتە تامال ومندالی قالە بۆلادێ بگەڕێنێتەوە ، بەلام قالە بەم هەلوێستە قایل نابێتو سوور دەبێت لەسەر ئەوەی کەماڵی حەمە سالح بمێنێتەوە هەرکە ناحەزیشیەتی . بەلام مندالەکانی قالە بڕیار دەدەن کە بگەڕێنەوە بۆ لادێ لەگەل مامە عەلییاندا . بەم شێوەیەش بڕوا بەخۆکردن لەدلیاندا جوکەرە دەکاو ، لەژێر ڕکێفی قالەی سەرخۆشی باوکیان دەرباز دەبنو دەردەچنو ڕوو دەکەنە لادێ .. بەو هیوایەی کە بۆماوەیەکی کەی نادیار بگەڕێنەوە بۆ شار ، بەلام نازانن کەی دەگەڕێنەوە بۆ شار جارێکی کە وەك لەلاپەرە ( ٧٠ ) دا لەسەر زمانی عەلیبەوە هاتووە دەڵێ :

« کەس نازانێ .. دوای سالێك .. دوو سال . دەسال لەوانەیە هەرێك نەکەوێ بۆت کە بگەڕێتەوە بۆشار . ئەوە لەسەر هەولی خۆتو منالەکانت ئەوەستێ .. کە تاکو چ ڕادەیەك سوود لەو زەویە وەرئەگرێتو بەرهەمێکی باش ئەهێنێتە دەس ، کەبۆی بتوانی لەشارا خانوویەك دروست بکەیت .

ئەمجارەشیان هەتا وەختی بۆ شارهاتنت نەیەت ، ناهێلم دێ بەجێ بهێلن . » . قالەیش وەلامی دەداتەوەو دەڵێ : « بەلام من جارێ بەوە ڕازی نەبووم کەشار بەجێ بهێلمو بێم بۆلادێ تاکو نەهێلی بگەڕێینەوە . » .

ماڵی عەزە حەز ناکەن مندالەکانی قالە ڕوو بکەنە لادێ . هەر بۆیەش بەلێنیان دەدەنێ کە لەلادێ گەڕانەوە ژوورێکیان بدەنێ بەلام ئەوان ناچنە ژێر باری ئەو بەلێنانەوە وەك لەم گفتو گۆیەدا دەردەکەوێت کەلەلاپەرە ( ٧٦ و ٧٧ ) دا هاتووە :

**عەزە : ( بەعەلی ) کاکی خۆم .. کە گەڕانەوە من هەر ئامادەم ژووریکتان بدەمێ هەر بەحسابەکەی جارانیش .**

**نەسرین : ئەمجارەیان کە گەڕاینەوە .. ژوور بەکرێ ناگرین ، چونکە خانوو دروست ئەکەین .. ئێمەش وەکوو ئێوە خانوومان ئەبێ .**

ئەمە هەموو دەربارەی ناوەڕۆك بوو کەباسمان لێوە کرد . بائێستاش بێینە سەر باسی هونەریو تەکنیکی نووسینی شانۆگەریەکەدا .

بەکارهێنانی ( کۆرس ) لەشانۆگەریدا وەك دەربڕینی بیرو باوەڕو دەنگی نووسەر دێتەکایەوە لەسەر شانۆدا، بەتایبەتی لەشانۆی یۆنانیی کۆندا ، کە زۆر جار نووسەرانی ئەو سەردەمە ( کۆرس ) یان بەکار دەهێنا لەشانۆگەریەکانیاندا . لە شانۆگەریی ( میدیا ) دا (یۆرپیدس) کۆرس بەکار دەهێنێت وەك هەلوێستو دەنگی نووسەر خۆی. ( یۆرپیدس ) پشتگیریی ( میدیا ) دەکات ڕوو بەڕووی مێردەکەی کەژنی بەسەر دەهێنێت . بەم شێوەیەش ژنە سەرکردەی کۆرس دێتە قسەو دەڵێ : « [ هەر شتێك داوا بکەیت ] بۆتی جێ بەجێ دەکەم ماف لەگەل تۆدایە ئەی میدیا لە تۆلە سەندنەوەت لەمێردەکەی خۆت » (١) . لە هەمان کاتیشدا نووسەر دەنگی نارەزایی دەردەبڕێت بەڕووی (میدیا) دا ، کە ( میدیا ) لەرقی مێردەکەی هەردوو جگەر گۆشەکەی خۆی دەکوژێت . ژنە سەرکردەی کۆرسیش وەك دەنگی ( یۆرپیدس ) خۆی ئەم کارەی ( میدیا ) بەشتێکی نارەوا دادەنێو دەلێت : « ئەی کەساس ، ئایا دلت لەبەردە یاخود لەئاسن تادوو مندالەکەی خۆت بکوژیت ، ئایا چۆن دەستت لەوە دەچێت کە لەبەرو بومی گۆشتو خوێنی خۆتەو هاوردوویشتەتە ژیانەوە ، ئایا بەدەستی خۆت هەردووکیان دەکوژیت !!! » (٢) .

ئەمە دەنگی یۆرپیدسە کە بەزمانی کۆرسو سەرکردەی کۆرسەوە هاتووە . لەبەر ئەوەی پالەوانی شانۆگەریەکە ( میدیا ) ژنە لەبەر ئەوەیش کۆرس لەپازدە ژن پێك هاتوون ، ئەمەیش وەك تەکنیکێکی چەسپاو لەسەردەمی یۆنانیی کۆندا بەکاردەهێنرا ، گەر پالەوانی سەرەکیی شانۆگەریەك ژن بووایە کۆرسیش لەژن پێك دەهات ، وەئەگەر بەپێچەوانەوەیش پالەوانی سەرەکیی شانۆگەریەك پیاو بووایە کۆرسیش لەپیاو پێك دەهات .

وە ( ئیسخلۆس ) کۆمەلێك ( جوقە ) بەکاردەهێنێت لەشانۆگەریی ( فارسەکان ) دا ،

وەئەم کۆرسەیش لەدارو دەستەنەی پادشای فارس ( داریۆس ) پێك هاتوون . شانۆگەریەکەیش لەدوای جەنگی ( سلامیس ) تی نێوان ئەتیناو فارس ڕوودەدات . لەو جەنگەشدا فارسەکان دەشکینەوە داریۆشیش لەو شەڕەدا دەکوژرێت . کۆرسیش بەزین و تێشکاندنی وولاتەکەیان دەگەڕێننەوە بۆ ویستی خواوەندەکان وەك نووسەر خۆی دەبەوێت . بەم شێوەیەش ( ئیسخیلۆس ) کۆرس دەخاتە قەو دەڵێن :

« ئای .. ئای زیۆس موڵك هەر بۆتۆیە . بەڕاستی سوپای فارسی لەخۆبای بەژمارە زۆری خۆبانەوەت وێران کرد ، وەخەم و خەفەت و کەساسیت لەشاری سوساو ئەکیاتاندا بلاو کردەوە ! .. چەند ژن بەشداری خەم و خەفەتمان دەکەن و یەخەی خۆیان دادەدڕن بەدەستی نەرمیان ..»(٣).

ئەمە دوو نموونەی بەکارهێنانی کۆرس بوو ، وەك لە سەردەمی یۆنانیی کۆندا نووسراونەتەوە . بەڵام ئێمە بۆمان نیە بەکارهێنانی کۆرس وەك باوە بەسەر گاك فەهمیدا بیسەپێنین بەزۆر . بزانین کاك فەهمی چۆن کۆرسی بەکارهێناوە لە شانۆگەریەکەیدا ، لە شانۆگەریی ( ژان ) دا کۆرس لەدوو بەش پێك هاتووە ، هەر بەشێکیش لەو دوو بەشە قسەکانیان بەپێچەوانەی قسەو بۆچوونی بەشەکەی تریانە . بەشی یەکەم لە کۆرس لەمندالانی گەڕەك پێك هاتوون و بەفیتی فاتە ڕەش لەکۆلانەکەدا دەنگ بلند دەکەنەوە بە مەبەستی تەنگ پێ هەڵچنینی مالی قالە . بەلام کۆمەلی دوهەمی لە شانۆگەریەکەدا نازانین کێن و تەمەنیان چەندە ؟ بەلام ئەوەندە دەزانین بەپێچەوانەی کۆمەلی یەکەم لایەنگریی مالی قالە دەکەن و ئاسۆی بەرفراوانیان بۆ ڕوون دەکەنەوە . کۆمەلی کۆرسی یەکەم لە دیوی کۆلانەوە دەنگیان بەرز دەبێتەوە بەبێ ئەوەی بینەر بیان بینێت ، بەلام کۆمەلی کۆرسی دوهەم نووسەر ڕوونی نەکردۆتەوە کە ئایا دێنە سەر شانۆ یاخود نا ؟

ئێمە دەزانین کە شانۆ هەر لەدێر زەمانەوە ، وەك هەموو بەشەکانی کەی هونەر خۆی لەشێوەی ئاسایی و فۆتۆگرافیەت دوور خستۆتەوە ( بەلام دەبێت مەبەست لەواقیعەوە بۆ واقیع بێت ) ، بۆیە زۆر جار هونەری شانۆ لە شێوەی دەربڕینی ئاسایی لایداوە بۆ گێڕانەوەی واقیع، بەشێوەیێکی دەربڕینی نا ئاسایی . ئەمەش بگرە هەر لەسەردەمی میسرو یۆنانی کۆنەوە تاکو ئەمڕۆی ئێستامان . شێوەی دەربڕینی نائاسایی بەتایبەتی لەشانۆگەریەکانی بیراندێللۆو ستراندێرگ خۆی بەزەقی دەنوێنێت . وەئەگەر بێت و شانۆگەریەکانی ولیام شکسپیریش وەربگرین دەبینین زۆر جار لە شێوەی دەربڕین بەجۆرێکی ئاسایی خۆیان لاداوە ، ئەویش بەدەرکەوتنی گەلێ شتی نا ئاسایی ڕۆژانەی ژیان لەسەر لەسەر تەختەی شانۆ، وەك دەرکەوتنی جلفر ( مهرج ) تارمایی و جنۆکەو جادو گەرو گەلێ شێوازی تر لەم بابەتانەوە ..

دەتوانین هەندێ ئەو لایەنانەی کە شانۆگەریی ( ژیان ) دا هەن و شێوەی نائاسیان گرتۆتە خۆیان بەکورتی دەستنیشانیان بکەین . بەتایبەتی کەکۆرسی یەکەمدا دەردەکەوێت ، کە دەنگ دەنگی مندالانەو بەشێوەی هەلبەستێك لە کۆلانەکەوە بەم شێوەیە دەیلێن :

**کچە هەتیوێك دایکی نەمابێ**
**ئەمڕۆ ئەم مالو سبەی ئەو مال کات**
**کە کەسێ نەبێ ڕووی خۆی لێ**
**تال کات**
**ساتووشی ڕۆژی ڕەشی خۆی ئەبێ**
**نەك کچ مام پۆلیس کچ پێغەمەر بێ**

ئەم دەنگەیش بۆ سێ جار لەلایەن کۆرسی مندالانەوە بلند دەبێتەوە لە شانۆگەریەکەدا .

وەیاخود کۆرسی دووهەم یەك ووتە لە شانۆگەریەکەدا بۆسێ جار دەیلێنەوە ، کەویش بەم شێوەیەیە :

**دە پێ بکەنە .. دەپێبکەنە .. کچی**
**ڕیواس**
**تەنها لە پێکەنینتا .. چرۆکان دەم**
**ئەکەنەوە**
**دەپێ بکەنە .. دەپێبکەنە .. کچی**
**ڕیواس**
**تەنها لەپێکەنینتا . خوا ملوانکەی**
**گولەمێخەك**
**بەدلدارەکان ئەبەخشێ ..**
**تەنها لە پێکەنینتا.. ڕیواسەکان مزد**
**ئەبن**
**تەنها لەپێکەنینتا .. خەوی هەزار**
**سالەمان**
**لەبار ناچێ ..**
**دەپێبکەنە کچی ڕیواس .**

وەیاخود شێوەی دەربڕینی نائاسایی لە گێڕانەوەی خەونەکەی فەرماندا لەسەر شانۆ دەردەکەوێت، وەیاخود لەو پەل هاویشتنانەدا بۆ مالی حمە سالح .. وەیاخود کە قالە لەبەشی یەکەمداو لە لاپەڕە (٨)دا

کەفە ئاراستەی جەماوەر دەکات. وەیاخود لە لاپەڕە (١٠)دا ئەم گفتو گۆیە بەشێوەیەکی نائاسایی ڕوو دەدات .

**عەزە سمێل : بیشمکەویّ نامەویّ ( بەئاوازەوە )**
**قالە : بیشتکەویّ ناتەویّ(بەئاوازەوە)**
**عەزە سمێل : بیشمکەویّ(بەئاوازەوە)**

وە هەروەها کەفەرمان منداڵەکانی گەڕەکەکە گوایە دەداتە بەر چەخماخە .

دەرچوون لە شێوەی دەربڕینی ئاسایی ڕۆژانە وەك خۆیو کردنەبەری بەرگێکی نائاسایی بەباڵای شانۆدا بەدوو لایەن دەردەکەوێت ، یەکەم بەلایەنی تێکستی شانۆو دووهەم بەلایەنی باری دەرهێنانو جۆری هەڵسو کەوتی کەسانیی شانۆگەریەکە . دەربڕینی نائاسای بەلایەنی تێکستی شانۆوە لەسەر شانۆدا لەم چەرخەماندا بۆ نموونە لەشانۆگەریەکانیی شانۆگەری نووسی ئەسپانی ( ئەلیخاندرۆ کاسۆنا ) دا بەدی دەکرێت . وەشێوەی دەربڕینی نائاسایی بەلایەنی تێکستو باری دەرهێنانو جۆری هەڵسو کەوتی کەسانی شانۆگەریەکە لەمچەرخەی‌ئێمەدادوو ڕێبازی سەرەکی لەبەرهەمەکانیاندا دەیخەنە ڕوو ، یەکەمیان ڕێبازە نامۆییەکەی ( تغریب ) ( برتۆلد بریخت )وە دووهەمیشیان ڕێبازی بێهوودەیی ( عبث ) یەکانە .

ناتوانین بەهۆی تاقە بەرهەمێکەوە کاك کەهمی بخەینە نێو شوورەی یەکێك لەم قوتابخانانە . بەلام داتاشین بەلای ( بێهوودەیی ) دا لەشانۆی (ژان) دا تاڕادەیەك خۆی دەنوێنێت ، وەك لە لاپەڕە (١١)دا بەزمانی قالەوە هاتووە :

**قالە : ئەحەی کوڕم برسیتە خۆڵ بخۆ . هەر بیخۆ هەر تەواو نابێ ، بیخۆی یانەیخۆی هەر ئەبیتە خۆڵ .. ژیان ئەوکاتە خۆشە کەژان بێ.. ژیان ئەوکاتە خۆشە بەعیللەتەوە بیبەیتە سەر .**

ئەم دەنگە من بەدەنگی قالەی بەتەنها نازانم . بەڵکو بەدەنگو هەڵویستیی نووسەری دەزانم .

هونەرمەند وەك تاکێك لەنێو نەتەوەکەیدا ، بەهەموو توانایەکیەوە خواستو ئارەزووەکانی میللەتەکەی لە هونەرەکەیدا دەردەبڕێتو بەرهەمەکانیشی ڕەنگدانەوەی هەڵچوونو داچوونو هەڵسو کەوتیی ژیانی ڕۆژانەی میللەتەکەیەتی ، هونەرمەندی ڕاستەقینەیش ئەو هونەرمەندەیە کە بتوانێت بەتەواوی پاڵپشتی نەتەوەکەی بکاتو هەوڵی سەر بەرزیان بدات وەك بەشێکی گرنگی کۆمەڵگای مرۆڤایەتیی سەر ڕووی ئەم زەمینەیەمان ، وەك ( پاڤیل کورین ) ی ڕووسی دەڵێت « هونەرمەندی نەتەوە پەرستیی ڕەسەن ئەو هونەرمەندەیە کەپەیوەندیەکی بنەڕەتی بەچەرخەکەیەوە دەیبەستێتەوەو ، دەرك بەچارە نووسی مێژوویی‌و ئامانجە مێژوویەکانیو ڕەوتی دەکات ، وەخۆی بەبەرژەوەندیە بەرزەکانی نەتەوەکەی تەرخان دەکات ، وەبیرو باوەڕو هەستەکانی بەزمانی نەتەوەکەی دەردەبڕێت » (٤) .

هونەرمەندو نووسەرە پایە بلندە بەرزەکانی جیهان هەموویان لەپێش هەموو شتێکدا ئاوێنەیەکی بێگەردی مللیەتەکانی خۆیانن . تۆلستۆیو دیستۆیفسکیو چیخۆڤو گۆرکی ئاوینەی بێ گەردی میللەتی ڕووس سەردەمی خۆیان بوون . وەهەرکەسێك لە هەرسەردەمێکدا بیەوێت بەتەواوی لەژیانو هەڵسو کەوتی میللەتی ڕووس شارەزایی پەیدا بکات لەکۆتایی چەرخی نۆزدەهەمو سەرەتای چەرخی بیستەمدا ، دەتوانێت بەهۆی بەرهەمی ئەو کە لەنووسەرانەوە شارەزاییەکی تەواو بەچنگ بهێنێت . هەروەها بەرهەمەکانی ( بلزاك ) ڕەنگدانەوەی باری ژیانی کۆمەڵگای میللەتی فەرەنسیە لەسەردەمن خۆیدا . وە ( دۆن کیشۆت ) ەکەی ( سیرڤانتس ) ڕەنگدانەوەی سەردەمی سوارچاکیی سەدەی هەڤدەهەمی میللەتی ئەسپانیە . نووسەرە یۆنانیە کۆنەکانو (ئەلیادە) کەی (هۆمیرۆس) ڕەنگدانەوەی بیرو هۆشو هەڵسو کەوتی نەتەوەی یۆنانی کۆنو گەر بێتو هەر بەرهەمێکی ئەدەبی بتوانێت پڕ بەپێستی خۆی وێنەی میللەتێك بکێشێت ، ئەوە لە ئەنجامیشدا دەتوانێت سنووری ئەو میللەتە ببڕێتو ببێتە بەرهەمێکیی بەپێزی جیهانیی مەزن. زۆر ڕاستە کە سیرڤانتس کاتی خۆی دەربارەی (دۆن کیشۆت)ەکەی نووسیویەتیو ووتوێتی « وادە خەمڵێنم کە هیج میللەتێك یاخود زمانێك نابێت کە پەرتووکەکە وەرنەگێڕنە سەری » (٥) سیرڤانتس ڕاستی فەرمووە ئێستاکی ئەم ڕۆمانە وەگێڕاوتە سەر زۆربەی زمانانی جیهان

( بەڵام بەداخەوە ئێستاکی سیرڤانتس نەماوەو مردووەو ، لەوە ئاگادار نیە کە پەرتووکەکەی وەرنەگێڕراوەتە سەر زمانی کورد . . ! ) گەر نووسەرێك نەیتوانی نووسەرێکی نەتەوەیی بێت ، ئەوە لەئاکامیشدا ناتوانێت نووسەرێکی جیهانیش بێت ، بەڵام بەرهەمی نەتەوەیی مانای ئەوە نیە کە مەحەلی‌ی شوێنی‌ی ئاسۆ تەسك بێت ، گەر نووسەرێك دەستی‌دایە نووسینێك دەبێت ئەوە لەمێشکی خۆیدا دابنێت کەلەسەر نەتەوەکەی‌و بۆنەتەوەکەی دەنووسێت . وەئەو شتەیش نابێت لەبیری خۆی بەرێتەوە کەئەو نووسینەی بۆی هەیە وەربگێڕرێتە سەر زمانانی بێگانە ، لەبەر ئەوەیش دەبێت بەشێوەیەکی وابنووسرێتەوە تاکو میللەتەکەی خۆی میللەتەکانی کەیش چێژی لێ وەربگرن . بۆنموونە (ئەلیادە)و (دۆن‌کیشۆت)و (هەروئاشتی)و (زۆربای یۆنانی)ە حەموو میللەتانی جیهان تێکرا وەك یەك چتژیان لێ وەردەگرن . ئێمەی کورد لەمەیدانی چیرۆك نووسیندا ، نوسینی وامان هەیە ، تەنانەت نەك میللەتانی جیهان ، بەڵکو بگرە خوێنەرانی کوردیش لێیان تێ ناگەن . من لەو بڕوایەدام کەچیرۆکی وەهامان هەیە کەبەناوی نوێ خوازیەوە نووسراونەتەوە بێت‌و وەربگێڕدرێنە سەر زمانی‌ی ئینگلیزی‌و ( جێمس جۆیس )و ( ولیەم فۆلکنەر )و (ڤرچینیا وۆلف) کە ئەمانە بەداهێنەری چیرۆکی تازە دادەنرێن ، بێت‌و زیندوو بنەوەو ئەو چیرۆکە کوردیانە بخرێنە بەردەستیان ، لەو بڕوایەدام کە ئەوانیش هیچی لێ تێ ناگەن . . !

هەمان باسیش دەربارەی بەشێکی شیعری نوێی کوردیش دەووترێت .. لەوانەیە بڵێن بۆ لە باسەکەمان دەرچووین‌و ئەو هەموو شیرو ڕێویەمان هێنایەوە ؟ منیش دەڵێم کە نووسەری ( ژان ) توانیویەتی بەزمانی پڕ لەمانای نەتەوایەتیەوە بەرهەمەکەی بنووسێتەوەو دەربارەی پەیوەندی‌ی ڕۆژانەی کۆلانێکی دواکەوتووی میللەتەکەی بدوێت. ئەمەیش شتێکی زۆر جوانە لەلایەن نووسەرەوە ، وەخوێنەری کوردیش کەبەرهەمەکە دەخوێنێتەوە لێی تێ‌دەگات‌و هەرکە ڕەمزیشە چێژیشی لێ وەردەگرێت‌و بەبەرهەمێکی کاریگەری دادەنێت‌و پیرۆزباییش لەنووسەر دەکات لەبەر ئەوەی کە توانیویەتی باسێکی زۆر گرنگ دەربڕێت‌و بیخاتە بەردەم خوێنەران .. بەڵام چێژ وەرگرتن لەم بەرهەمە بەتەنها لەمیللەتەکەی نووسەر تێ ناپەڕێت ، وەگەر بێت‌و ئەم بەرهەمە وەربگێڕرێتە سەر هەر زمانێکی بێگانە،هیچ کەس‌لەومیللەتانە چیزی لێ وەرناگرن‌و بە بەرهەمێکی وای دادەنێن کەدەربارەی پەراوێزی واقیع‌و ڕاستەقینە دەدوێت نەك دەربارەی واقیع‌و ڕاستەقینە ..

بەرهەمی تەم‌و مژ یاخود بەرهەمی ڕەمزی‌و هیمای‌ی مەرج نیە کەوا بنوسرێتەوە ، کەوەك لەژوورێکدا بێت وە هیچ کلیلێك نەتوانێت دەرگای بکاتەوە . شیعرە تەم‌و مژاویەکانی ( ئیلیۆت ) پێویستی‌ی بەرۆشنبیریەکی زۆر هەیە، تا خوێنەر بەهۆی ئەو ڕۆشنبیری‌یەوە بتوانێت لێی تێ بگات . وەیاخود بەرهەمە ڕەمزیەکانی ( فرانز کافکا ) زۆربەی خوێنەرانی میللەتانی جیهان خوێنەری قوول ـ لێیان تێ دەگەن ( هەرکە هەر کەسەو بەجۆرێك بۆیان دەچێت ) . سەرەڕای ئەو هەموو مژانەی کەتیایدا نووقم بوونە ، وەك پەیکەرێکی نێو دووکەڵێکی چڕ خوێنەرێك خاوەن ڕۆشنبیریەکی باش بێت ، گەر بە چاویش نەبێت بەڵام بەدەستە کوتێ دەتوانێت هەست بەقەوارەی پەیکەرەکە بکات .

( مەکسیم گۆرکی ) هەر کە داهێنەری قوتابخانەی ڕیالیزمی‌ی سۆشیالیستیە بەڵام چیرۆکی ڕەمزیشی نووسیوەتەوە لەکاتی خۆیدا ، وەك لە کورتە چیرۆکی ( گۆرانیەك دەربارەی باڵندەی ڕەشەبا [ اغنیه عن طائر النوء ] ) دەردەکەوێت . لەم چیرۆکەدا باڵندەی ڕەشەبا بەنێو هەڵچوونی سروشتدا بێ ترس ئاسمانی پان‌و بەرین دەبڕێت « ئەمەیە باڵندەی ڕەشە با بێ باکانە بەنێو چەخماخەداو بەیان دەربارەی تووڕەدا دەدات لەشەقەی باڵ ، پەیامنێری سەرکەوتن هاوار دەکات :

ـ زریان یا زیاتر هەڵکا ! . . »(٩)

ئەم کورتە چیرۆکە بەتام‌و چێژە ساکارە ، هەرکە بەشێوەی هیماو ڕەمزیەتیش نووسراوەتەوە ، بەڵام خوێنەر لەهەموو کونجێکی جیهاندا لێی تێدەگات ، هەموو کەس دەزانێت باڵندەی ڕەشە با ڕەمزە بۆ چینێك یاخود دەستەو کۆمەڵێکی تایبەتی‌ی دیاریکراو .

لە کۆتاییدا بەوپەڕی دڵنیای‌ی‌و بڕواوە دەڵێم نووسەری شانۆگەری‌ی ( ژان ) بەسەرەتایەکی سەرکەوتوانەوە دەستی پێ‌کردووەو هیوای بەرهەمی بەپێزو پوختەی کەی لێ دەکەین بۆ ئەوەی کتێبخانەی

کوردیو تەختەی شانۆمان
ەرهەمی دەولەمەند بێت ●

## پەراوێزەکان

(١) مجله الاقلام ، العدد ٥ السنه التاسعه ١٩٧٣ ، مسرحیة (میدیا) لەنووسینی نووسەری یۆنانی ( یۆرپیدس ) ، وەرگێرانی : کمال ممدوح مهدی ، ل ٧٧ .

(٢) سەرچاوی پێشوو ، ل ٩٠ .

(٣) الفرس والضارعات . نووسینی نووسەری یۆنانی ( ئیسخلۆس ) ، وەرگێرانی : دکتور ابراهیم سکر ، الدار المصریه للتالیف والترجمه اغسطس ١٩٦٦ ، ل ٤٦ .

(٤) الواقعیه الاشتراکیه فی الادب والفن، نووسینی کۆمەلە نووسەرێکی سۆڤیەتی ، وەرگێرانی : محمد مستجیر مصطفی ، دار الثقافه الجدیده القاهره ١٩٧٦ الطبعه الاولی ، ل ٩٤ .

(٥) مجله افاق عربیه ، السنه الخامسه ، العدد ( ٢ ) تشرین الاول ١٩٧٩ ، دون کیخوت ودون جوان ، نووسینی : سیزاری روفینسکی ، وەرگێرانی : عدنان المبارك ، ل ٧٥ .

(٦) مولد انسان ( قصص مختاره ) لەنووسینی : مەکسیم گۆرکی ، وەرگێرانی : غائب طعمه فرمان، دار التقدم موسکو ، بروانە کورتە چیرۆکی ( اغنیه عن طائر النوء ) ل ٣٠٣ .

**قوتابخانە میللییەکان چەند دەرفەتێکی نوێن شۆرش بە سەرکردایەتی سەرۆکی تێکۆشەر صدام حسین بەدی هێناون**

**چوونە قوتابخانە میللییەکان ئامانجە نیشتمانی و نەتەوەیی و مرۆڤ پەروەرییەکانی هەلمەتەکە دەهێنێتە دی**

# لەبارەی داستانەکەی

# ڕۆستەمو زۆراب

●صابر کریم●

با ئاوڕێك لە داستانەکەی ڕۆستەمو زۆراپ بدەینەوە !! بەدرێژایی سەدەکانی رابردوو ، زۆر لەداستانو سەر گورشتەی دلداری وپالەوانێتی بەسەر زاری خەلکیەوە بوونو بابەتی گوێ ئاگردانی شەوانی زستانی ناو کوردەواری بوون ، ئێستا لەم سەردەمەدا ئەم دیاردەیە سست بووە کەچی هێشتا هەر ماوەو بەلآم لەڕوی شێوەو ناوەرۆکەوە ئەو نووسینەی کەبۆ سالەکانی چلەکانو پەنجاکان نووسراوەتەوە ناتوانرێتلەم سەردەمەدا بەسەرگشتی خوێندەوارانی بسەپێنرێت چونکە ژیان ڕۆژ لەدوای ڕۆژو سات لە دوای سات بەرەو ئالۆزی گلور دەبێتەوە ، ئێستا نووسین تەنها بۆ کات بەسەربردن نییە وەکوو لە رابوردوودا باو بووە ، ئێستا لەم سەردەمەدا گەلێك گیروگرفت بەرۆکی ئادەمیزاد دەگریتو دەیانوێت بەرەو کەندەلآنی سەر لێشێوانو نەمانی ببەن ، بۆیە خۆماندوکردنو کۆشش کردنی دەوێت کە مرۆڤ بەسەریاندا زاڵ بێت بەکەم چەکیش پێنووسە ...

( شی کردنەوەو پشکنین ـ ئەمەیە ئەم کاتەی ئێمەی تێدا دەژین ئێستا رەخنە لەهەموو شتێك ئەگیرێ هەتا لەرەختە خۆشی ئەم چاخەی ئێستامان شتێك یەکسەر وەرناگرێت ) (١)

ماوەیەك لەمەو پێش ، داستانێکی ڕۆستەمو زۆراب لە کتێبێکی قەوارە مام ناوەندی (١٢٠) لاپەرەیی لەلایەن عبد الخالق محمد امین دەرچوو ، کە لەسەر بەرگەکەی سالی ( ١٣٩٩ هـ ـ ١٩٧٩ م ) نووسراوە، کەچی سەیر لەوەدایە کە هەمان چاپی سالی (١٩٥٥م)ە ، بەبێ ئەوەی هیچ جۆرە دەستکارییەك بکرێت تەنانەت ئیملاکەی دەستکاری نەکراوە ، کە بەهیچ شێوەیەك لە گەل ڕێبازی ئیملای کوردی ئەمرۆمان ناگونجێت ، ژیان بریتیە لەگۆڕان بەرەو پێشەوە ، گەر بەوردی سەرنج بدەین دەبینیت لە سالی (١٩٥٥)ەوە بۆ ئەم کاتە چەندەها کتێبو نامێلکە لە سەر ئیملاو ڕێزمانی کوردیو بەشەکانی تری زمانی کوردی دەرچووە ، باشترین نموونە بۆ سەلماندنی ئەم قسەیەم کتێبەکەی ( طاهر صادق )ە بەناوی ( ڕێنوس ـ چۆنیەتی نووسینی کوردی ) ، هەروەها ئەوەندە ووشەی عەرەبی تێدا دەبینرێت کە لەژمارە نایەت بەرای من پێویست بوو لەسەر کاك عبد الخالق لەپێش ئەوەی دەست بکات بە لەچاپدانی، لەپیشدا لەسەر شێوەی ڕێنووسی ئەم سەردەمە دەستنووسی بکردایە ، بەپێی پێویست هەولێکی بدایە بۆ گۆڕینی هەندێ لەو ووشە عەرەبییانە بۆسەر زمانی کوردی ، لێرەدا بۆیە حیسابی ئەم جۆرە شتانە دەکەین ، چونکە داستانەکە لەم ڕۆژانەدا بەچاپ گەیەنراوە ( کۆتایی سالی ٩٧٩ )، هەروەها لە توانادا هەیە داستانێکی ئاوا بۆ هەر زمانێك بگۆردرێ نەك تەنها لە ڕێنوسێکی کۆنەوە بۆ تازەتر ، ئەمە لە لایەن ڕێنووسەوە ، هەروەها لە ڕووی ڕێزمانییەوە ئەوەندەی تر داستانەکە هەلەی تێدایە .ئێمە گەر سوودی گشتی بخەینە بەرچاومان، بۆ پێشکەش کردنی هەر بەرهەمێك ، پێویستە بەپێی توانا هەول بدەین بەبێ کەمتەر خەمی ، بۆ ئەوەی سوود بەخوینەر بگەیەنینو سەرکەوتن لێرەدا دێتەدی ....

بێگومان ئەوشتانەم بۆ ئەوە نەخستۆتە بەرچاو کە ورە بە کاك عبد الخالق بەربدەم . بەلکو بۆئەوەی کە نوسینەکانی زیاتر جێی خۆی لە دلی خوینەران بکاتەوە ...

## سەرچاوەکات

(١) بلنسکی ـ دەربارەی رەخنە ، وەرگێر لە روسیەوە جەلال تەقی چاپخانەی ، سالی ١٠٧١

(٢) روستەمو زۆراپ ، ١٩٧٩ م دار المثنی للطباعه والنشر

(٣) ڕێنوس ( چۆنیەتی نووسیتی کوردی ، مامۆستا طاهر صادق سالی ١٩٦٩ ، چاپخانەی شیمال ـ کرکوك )

# زەکی ئەحمەد هەناری و وەرگێڕان

ـ کەماڵ مستەفا مەعرووف ـ



● کەدەڵێین وەرگێڕان واتە وەرگێڕانی بەرهەمێك لە زمانێك بۆ زمانێکی تر بەشێوەیێکی پوخت وڕازاوە بەمەرجێ تام وچێژی بەرهەمەکە لەکاتی وەرگێڕاندا نەفەوتێ .

ئەگەر لەم سووچەوە سەیری ئەو بەرهەمە ئەدەبیانە بکەین کە مامۆستا زەکی ئەحمەد هەناری لە زمانی ئینگلیزیو عەرەبی و فارسیو تورکییەوە وەری گێراون بۆسەر زمانی کوردی ، دەگەینە ئەو ئەنجامەی کە مامۆستا زەکی لە هونەری وەرگێڕاندا دەستێکی باڵای بووەو گۆی خۆی لە هونەری وەرگێڕان بردۆتەوە سەرکەوتنی بنچینەیی وە دەست هێناوە .

هۆی ئەم سەرکەوتنانەش ئەوەبووە شارەزایی ولیهاتوویی باشی لە هەرچوار زمانەکە داهەبووە ، چ لەڕووی گفتوگۆ کردنەوە بووبێ یان لەڕووی نووسینەوەدا .

بەردەوام بەهەر چوار زمانەکە شەکاری ئەدەبی خوێندۆتەوە وەئەو بەرهەمانەی کاری تێ کردووە لەگەڵ تاسەو ئارەزووی گونجاوە وهەست ونەستی بزواندوە وەری گێڕاوەتە سەر زمانی زگماك .

بەپەخشان گەلێ بەرهەمی ئەدەبی وەرگێڕاوە لەوانە گولستانی سەعدی شیرازی لە فارسیەوە کردووە بە کوردی ، سالی ١٩٦٨ لە بەغدا چاپی کردووە سەرگووزەشتەی ژیانی محەمەد ( د ـ خ ) رێك‌خستەی ئیدن‌هۆلاند لە ئینگلیزی‌یەوە گۆڕیوە بۆ کوردی هێشتا چاپ نەکراوە .

هەروەها گرامەری زمانی کوردی لە ئینگلیزی‌یەوە کردووە بە کوردی کە نووسەرێکی ئەمریکی نووسیوێتی .

جگە لە چیرۆکەی مندالان کە لە ئینگلیزی‌یەوە وەری گێڕاوە بۆ کوردی هێشتا چاپ نەکراوە .

وەبە شیعر گەلێ شاکاری جیهانی وەرگێڕاوە ، لە زمانی فارسی شاکارەکانی سەعدی شیرازیو حافزی وەرگێڕاوە .

لە ئینگلیزی شاکارەکانی ڤیکتۆر هۆگۆو ولیەم‌شێکسپیری وەرگێڕاوە .

جا لێرەدا یەك دوو نموونە لە بەرهەمە وەرگێڕاوەکانی دەخەینە بەرچاو خوێنەرانی ئازیزی کورد واتەنی ( مشتێ نموونەی خروارێکە ) .

بەهیوای لە دەرفەتێکی تردا بەدرێژی بلاویان بکەینەوە ڕازو نیازی گوڵ هۆنراوەی ڤیکتۆر هۆگۆیە لە ئینگلیزی‌یەوە وەری گێراوە ، بەم شێوەیە دەست پێ دەکات .

**ڕازو نیازی گوڵ**

**گولێکی تازە پشکفتوی قەشەنگ**
**بەم پەروانەی وت لەسەرخۆ بێ‌دەنگ**
**کەسوك لەگەری نسێی‌دا ئەفری**
**بالی ڕەنگینی نەسیمی ئەدری**
**دلدار ! هاودەمی شەوی تاریکم**
**دۆستی ئەمەکدار بۆ جوانی ڕێکم**

وەرە پێشەوەرە ، خۆت دوور مەخەلێم
لەم جیهانەدا تۆی کە بچەرێم
لە میانەی بونو نەبون سەرگەردان
پەنجەی بەتێنی چارەنووس لێمان
ئاگەرێ ، زینهار ، مەبە دڵنیا
بەزویی ئەیوێ لێکمان کاجیا
ئەوکاتە هەتا هەتایێ ئەمن
ئەرۆم ، نامێنم لێتان ئەبم ون
بە ئاگاوەرە ! ژیانی مە تەنیا
کورترە لە ژیانی گش شتی دنیا
پاش چاو قووچێنێك چاوەدەی براوە
ریشەی ژیانم ، گەلام پچراوە
گۆڕی دلداری چەن تەنگە گیانە !
ژێ خۆشەویستی کورتەو لەبرانە
خۆزیا بۆ ئەمەی لە دلداری‌یێك
خۆشی‌مان دیبا لە یێکتر کەمێك
تولە دەماری باریکی تەنم
جێت ئەگرت‌ئەوت لەم ئشادیە منم ؟
لەم باڵە گچکەی ڕەنگینانەی خۆت
ئەتدامێ دیاریەك تامن‌ماوم بۆت

ئەمەش نموونەیێکی ترە لە شعری وایەم شێکسپیر لە ئینگلیزی‌یەوە کردوویەتی بە کوردی .

ئەمە خۆ دوور نی‌یە ڕۆژێ ئەستێرەکان
بەیێك بکەون ، پڕ بلێسەکەن جیهان
نبتۆن وئۆرانۆس لێك‌دەن ولەناکاو
لە چەرخەوە بۆ زەمین تاویدا کەیوان (١)
رۆژ ساردو بکوژێتەوە ، لە جێی ئەوا
(٢)سها لوەبدا ، سهیل (٣) بێتە تابان
ئەمانە دوور نین ببن بەلام ئەبتە دوور
دلداری تۆم لەسەرا دەرچی هەی‌گیان !

١ ــ زحل
٢ ــ بنات النفس
٣ ــ کاروان کوژ

لە ئەدەبیاتی سەعدی شیرازی ( دووانی مۆم وپەروانە ) ی وەرگێراوە .

### دووانی مۆم وپەروانە

لە یادمە شەوێ چاوم نەچوەخەو
بیستم پەروانە بە مۆمی‌ی ووتەوە
منێکی دلدار بسووتێم حەقە
گریان ، سوتانت چی‌یە بێ‌نقە ؟
وتی دلدارەی ! بی تەنەکەی من
شیرینی ڕۆیی یار شیرنەکەی من
کە شیرین ڕۆیی لەمن سەر لەبەر
وەك فەرهاد ئاوی دائەرژێ لەسەر
ئەی گوت‌و هەرکات فرمێسکی پردەرد
ئەهاتە خوارێ بەسەر ڕویی زەرد
ڕەوای یەکێکە دلداری کردن
خۆی بگرێ بێ‌دەنگ هەتاکو مردن
تۆ هەلدێی لەپێش گڕێکا هەی‌خاو
وەستاوم تا ئەسوتێم تەواو
بە ئاگری دلداری گەر بسوتێ پەڕ
من بینە اسوتام لە پێ هەتا سەر
ئەدواو ئەسوتا دووکەلی لەسەر
دووایی دلداری وایە بێ خەبەر
فیدایی لە ئامانج هەلناگرێ چەنگ
ئەگەر بۆسەری تیر باری یا سەنگ
پێت ئەلێم نەکەی بچیە ناو دەریا
کە چوی خۆت بدە دەس لافاویا

ئەمەش نموونەیێکی ترە لە شیعری فارسی وەرگێراوە بەناوی

### ( گفتوگۆی بولبولو پەروانە )

بیستم پەروانە ئەم کاتەی بولبول
ئەی‌نالاند لە تاو دەردی عشقی گوڵ
پێی ووت ئەم بانگ‌وهاوارەت چی‌یە ؟
لە دەست مەعشوقەت ئەم کارەت چی‌یە ؟
پێویستە عاشقی لەمنەوە فێربن
کەهیچ نانالم لە کاتی سوتن
ئەمەی بیست بولبول گریا پڕ بەزار
کەمن بەخت ڕەشم ئەتۆی بەختیار
بەختت یاوەرەو خۆشی وخەندەی
کە گیان لە ژێر پێی مەعشوقەت ئەدەی
هیچ کەس بە حالی من نەبێ خودا
یارم لە پێشی چاو ئەدرێتە بەربا
پێویستە لە سەر ئەم ژینەم گریان
کەبێ یار ئەبی بەرێ کەم ژیان

# سزادانی منداڵ



بنیامین یوخنا

**زۆر دایك و باوك لەو بڕوایەدان کە مەبەست لە ( سزا ) سزای لەشییە ( body punishment ) بەڵام هەر ئەوەیە کە منال دووچاری هەلە ئەکا ... چونکە لێدانی منال هەڵەیەکی گەورەیە و جۆرەها ئەنجامی سیلبی ( negative results ) وەدەست دێنیت و دەبێتە هۆی وون کردنی نرخی پەروەردەیی سزادان**

**ئەی باشە ، چۆن پێویستە منال سزا بدرێ ؟ کەی پێویستە سزا بدرێ ؟ ئەو ڕاسپاردانە چین کە پێویستە پەیڕەوی بکرێن ؟ زۆربەی پسپۆڕو دەروون ناسەکان ئەڵێن ، پێویستە پاش ماوەیەکی زۆر کورت لە ڕوودانی هەڵەکە منال سزا بدرێ و کاردانەوەی ( رد فعل response ) هەڵەکەی لێ ببینرێ ، هۆی ئەمەش ئەگەرێتەوە ئەو جیاوازییەی لە نێوان چەمکی کات ( مفهوم الوقت ) لەلایەن ئێمەو چەمکی کات لەلایەن منالەوە هەیە .**

دەربارەی ڕێگاکانی سزادانی منال ، پەسندترین و ڕاسترینیان ئەمانەن :ـ

یەکەم : بێبەری ( حرمان ) منال لە خۆشییەکی دیاری کراو ... دایکی زیرەك لێرەدا ئەو دایکەیە کە لە توانایدا دەبێ چەشنە بێبەریەك بدۆزێتەوە ، کە ئەو ئەنجامەی دەمانەوێ وەدەستی بێنێت بۆ نموونە : کە منالێك لە کاتی نان خواردنا بەدخویی پشان ئەدات ( شەڕ کردن ، قسەی ناشیرین کردن ، جنێودان ، هاوار کردن ... ) ، سزاکەی بەوە دەبێ داوای لێبکرێ بەشداری‌یان نەکات لە نان خواردنا و ، بەتەنیا نانی خۆی بخوات بەمە منالەکە ئەتوانێ بە ئاسانی لە ڕاستی بکات و ڕەش و سپی لە یەك جیا بکاتەوە واتە پێویستە پەیوەندی‌یەك ( relation ) هەبێت لە نێوان جۆری سزاکەو ئەو هەڵەیەی منالەکە دەی‌کا .

دووەم : دوورخستنی منال لە هاوڕێی و هاوەڵەکانی ، وە بێبەری کردنی لە یاری کردن لەگەڵیانا ، هەندێ جار وەك سزایەکی بەکەلك لە قەڵەم ئەدرێ ، بەڵام پێویستە ئەم سزایە کەم بەکاربهێنرێ وە لەکاتی بەکارهێنانی‌دا پێویستە بخرێتە نێو چوارچێوەیەکی کاتی ( time frame ) و ماوە کاتی‌یەکی ( فترە زمنیە ) دیاری کراوی بۆ تەرخان بکرێ . چونکە ئەو کاتەی منالەکە لەگەل دۆست و هاوەڵەکانی یاری ئەکات و هامووشۆیان لەگەڵ ئەکات ، هەولێکی بێ‌شومار ئەدات ، بۆئەوەی زاڵ بێ بەسەر کەمو کوریەکانی‌و هاوڕێ وهاوەڵەکانی ڕازی بکات

**زانای دەروون ناس سلاڤسۆن ( Slavson ) دەربارەی ئەم شتە ئەڵێ ( بەڕێگەی یاری کردن و هاموشۆ کردن ، منال بۆی هەیە هەناسە بدات ، وە کەمو کوڕی‌یەکانی خۆی دەربخات وە هەروەها یاری کردن لەلایەن منالەوە ئامرازێ ئەکرێ بۆ ئەوەی منال بە هۆیەوە گیرو گرفتەکانی خۆی ڕوو پۆش بکات ، یان بۆ ئەوەی خۆشگوزەرانی و ئاسەو ئارەزووەکانی خۆی مسۆگەر بکات .**

**سێیەم : هەندێ جار ، پاش ئەوەی منال هەڵەیەك ئەکا و بەد خوویی پیشان ئەدات هەست بەجۆرە پەشیمانیەك ئەکات واتە ئەتوانین بلێین ( خۆی سزا ئەدات ) .... سزای دایك و باوك لێرەدا بە چەند ـ جارەکردنی ( مضاعفە ) ئەم هەستە ئەبێ .**

بۆ نموونە : کچۆلەیەك کە بووکەشووشەکەی ئەشکێنی ، ئەم جۆرە ڕستانەی بۆ ئاراستە دەکرێ :

ئەوە بۆ بووکەشووشە جوانەکەت شکاند ... تەماشای کە چۆن ئەگری . تەماشاکە ... بووکەشووشەکەی نازداری خوشکت هێشتا هەر ماوە ئەو لەتۆ ژیر ترە .

**لێرەدا دەبێ ئەوەش فەرامۆش نەکەین ، کەوا زۆربەی ئەو منالانەی ، کە پاش کردنی هەڵەیەك هەست بە پەشیمانی ئەکەن ، خاوەن کەسایەتیەکی هەستیارن ( Sensitive personality ) ، لەبەر ئەوە پێویستە مامەڵەیەکی تایبەتی لەگەڵا بکرێت .**

# لاپەڕێك لە ژیانی دۆستۆفسکی

سەرگوزشتەی ژیانی دۆستۆفسکی ـ رۆمان نووسی بەناوبانگی روسیا ـ چیرۆکێکی رەنگینی ئەو تۆیە ، هەروەکو ئەوەی یەکێك لە چیرۆکە خەیالی یەکانی خۆی بێت .. هێشتا لە تەمەنی هەشت سالی دا بوو تارمایی مەرگی بە چاوان دی .

ئەمەیش لە رۆژێکی زستانی سالی ١٨٤٩ دا بوو ، دۆستوفسکی و «٢٠» هاورێی تری لە یەکێ لە گۆرەپانەکانی پایتەختی روسیادا وستابوون ـ ئەوسا ( بطرسبورغ )ی پێ دەووترا ـ چاوەڕوانی لە سێدارە دانیان دەکرد ، چاویان دە بەستنەوە ، بە دار تێلێکەوە دە بەسترانەوە .

ئەو ئەفسەرەی سەرپەرشتی دەستڕێژ لێ کردنەکەی دەکردن کەوتبووە دەنگە دەنگ و هات و هاوارو یەك یەك ناوەکانیانی دەخوێندەوەو دەیووت « حوکمی دەست ڕێژ لێ کردنی دراوە .. » سەربازەکانیش لەسەر پێ بوون بۆ ئەوەی دەست ڕێژیەکە بکەن تەنها چاوەڕوانی ئەوەیان دەکرد . ئەفسەرەکەیان لە خوێندنەوەی ناوەکان بێتەوەو ئەمریان پی بکات ..

لەپڕ ، پێش دەستڕێژکردنەکە بە چەند چرکەیەك، سوارێك گەیشت ، نامەیەکی لە قەیسەرەوە هێنابوو . ئەفسەرەکە نامەکەی خوێندەوە ، دیسانەوە دەنگی لی بەرز بووەوە ، رووی کردە ، پیاوە کلۆلەکان : « قەیسەر بەزەیی و میهری خۆی پێ بەخشیوون .. ژیانی گربونەتەوە ، فەرمانی دەست ڕێژەکەتانی گۆڕیوە ، بە دوورخستنەوەتان بۆ سیبریا ، لەگەل کاری قورس دا بۆ ماوەی چوار سال » .

ئەوەی راستبێ دۆستوفسکی هاوڕێکانی رێگرو تاوانبار نەبوون ، تا فەرمانی کوشتن و دورخستنەوەیان بەسەردا بدرێت .. بەلکو کۆمەلە گەنجێکی ووریا بوون ، بە تەنگی بەرزەوەندی وولات و زیانەوەی نەتەوەکەیانەوە دەهاتن .. هەستیان بە دواکەوتوی وولات و نەتەوەکەیان دەکرد ، بیریان لەوە دەکردەوە چی بکەن .. واتە شتێکان نەکردبوو لە سنوری یاسا بەدەر بێت . بەلکو هەموو چالاکیەکانیان لە سنوری قسەکردن و گۆڕینەوەی بیرو رابوو لە چوارچێوەی کۆبوونەوە نهێنی یەکانیاندا .. رەنگە هەر ئەم نهێنی یە ، بووبێت بە هۆی راستەوخۆ ، کە داروودەستەی قەیسەری وای لێ کرد . بەو جۆرەی باس کرا رەفتاریان لەگەلدا بکە ..

دۆستوفسکی لە سالی ١٨٢١ دا لە دایك بوو . دووەم کوڕی ، هەشت منالی باوکیشی پزیشك بوو، کە ناوبانگی بە نارەق خۆر دەرکرد بوو ، کابرایەکی دل رەق بوو ، لە مامەلەکردنی ئەو جووتیارانەی لەسەر زەوی و زارەکانی دا کاریان دەکرن. ئەوەندە دل رەق بوو لەگەلیاندا بە رادەیەك رۆژی هەلیان کوتایە سەری و کوشتیان .

بەلام مەرگی باوکی، وای نەکرد کە، دۆستوفسکی واز لە خوێندن بێنێ .. دانشگای تەواوکرد ، لە سالی ١٨٤٣دا بوو بە پسپۆڕی ئەندازەی سەربازی . بە پلەی ئەفسەری چووە ریزی سوپاوە بەلام دوای سی سال دەستی لەم کارەی هەلگرت .. بۆ ئەوەی خۆی



بۆ نووسینەوەی چیرۆك تەرخان بكات ، چونكە بە تاقە كارێكی دەزانی كە دەتوانێت بە هۆیەوە خزمەتی وڵاتو نەتەوەكەی بكات ..

ئەمجا رۆژگار تێپەڕیو مانگو ساڵ هاتنە پێشەوە ، دۆستۆفسكیو هاوڕێكانی لە سیبریا . خرانە بەندیخانەی «منسك»ەوە بۆ ماوەی «١٠» ساڵ لەو شوێنە دوورانە مایەوە . چوار ساڵیان هەر لەگەڵ زۆر جەردەكاندا بەكۆت زنجیرەبوو . شەش ساڵیشیانی لەسەربازیدا بە پلەی سەربازێكی رووت؛ بردە سەر دیارە بۆ ئەمەیان ناچار كرا دەبێ بیكات . ئەوەی سەیریشە دۆستۆفسكی بەم هەموو ئازارو ئەشكەنجەو دەردی سەری یە نەمرد .. هەر ژیاو گەلێ كۆسپو تەگەرەی تریش بڕی ، هەرچەند هەر لە منداڵی یەوە نابووتو كەم جوورمبوو .

بە هەر حاڵ ژیانی سیبریا كاری كردە سەر تەندروستی دۆستۆفسكی . تووشی فێ «الصرع» بوو هەتا مردیش هەر بەم دەردەوە دەی ناڵاند. لە سیبریادا ژنی خواستو توانی گەلێ كتێب بخوێنێتەوەو بگەڕێتەوە سەر نووسینەوەی چیرۆك لەو ماوانەدا كە لە سیبریادا بردی یە سەر . دوای ئەمە دۆستۆفسكی گەڕایەوە پایتەختی روسیا .

بۆ ئەوەی یارمەتی براكەی بدات لە كاری بڵاو كردنەوەداو بەردەوام بێت لە نووسینی چیرۆك .. بەڵام میشێلی برای مرد ، قەرزەكی زۆری هاتە سەر ، ناچاربوو بە پەلە پەل چیرۆك بنووسێت ، بەلای كەمەوە بۆ ئەوەی قەرزەكانی بداتەوە . لەم لایشەوە رۆژ بەرۆژ قەرزەكانی لە زیادیدا بوون .. دۆستۆفسكی قومارچی یەكی وەهابوو ، چی دەست بكەوتبایە لەسەر مێزی قومار دای دەنا .

دۆستۆفسكی ژنەكەی لە دەستچوو . لە ساڵی ١٨٦٧ دا ژنێكی تری هێنا . ئەم ساڵە وەرچەخانێكی گەورە بوو لە ژیانی ئەم نووسەرە مەزنەماندا . «آنا»ی ژنی ئافرەتێكی زۆر پاك رەوشتو ژنانەبوو .. توانی ژیانی مێردەكەی رێكبخاتو بەر لە تێپەربوونی كات لە قەرزەكانی رزگاری بكات .. دۆستوفسكی توانی بە بۆنەی ئەم ژنە باشەیەوە پارە كۆبكاتەوەو تامی خۆشی ژیان بچێژێ ، هەر چەند ئەم لە ئاخرو ئۆخری ژیانیدا بوو .. ئاشكرایە دەورێكی باڵای بینی لە هاندانو بەردەوام بوونی مێردەكەیدا لە نووسینو بڵاوكردنەوەدا ، لە سەرەتای ئەو چوار ساڵەوە كە بە دوو قۆڵی لە ئەوروپادا بردیانە سەرو هەتا كۆتاییش .

لە چیرۆكەكانی ئەم نووسەرە مەزنەمان ئەمانەن : « تاوانو سزا » ، « هەژارەكان » ، « یاداشت لە ئارامگاوە » و هی تریش دۆستۆفسكی لە ساڵی ١٨٨١دا لە تەمەنی دەوروبەری شەست ساڵیدا گیانی سپاردووە .

**سەرگوڵ محمد امین كردویەتی بە كوردی**

# میهڤانداریا دوو هونەرمەندا

**فاروق ئامێدی**

**( محمد عارف ) ی جزیری توت :**

**نکارم سترانا بێژم .. هەر دێ بێژم هندی من دەنگ مایە .**

**نەسرین شیروانی دبێژیت :**

**ئەز شەان بوم‌و کوچەری من کریە .**

دەمێ باسێ پەیسکا رەوشەنڤانیێ د کەین‌و چەند پێپەلیسك برینەو چەند بەرزو بلند بوویە ؟ . یان چەند کیویرو نزمە ؟ .

هەلبەت ئەڤە باسێ هەمی چەشن‌و تەرحەو تایێن رەوشەنڤانیێنە چ تورە یان چ مێژو یان زانیاری یان هونەر یان ... ت د .

ل ڤێرە مە د ڤێت باسی داڤەکا هونەری ب کەین کو تەرحەکە ژ رەشەنڤانیا مللەتی ، ئاشکەرایە گەر مللەتەك رەوشەنڤان نەبیت کێش‌و بهایێ هونەری نەزانیت‌و هیچ بایەخەکی پێ نادەت .. ل گەل هندێ چێ د بیت ب چاڤەکێ گەلەکێ سڤك بەرێ خو ب دەتە هەمی تایێت هونەری چ ستران .. ئەکتەر .. شانو .. بن .

ئەڤجا دەمێ رەوشەنڤانیا هەر مللەتەکی بەرفرە هـ د بیت‌و پێنگاڤا د رانیت بو پێشڤە پلەیا هونەری ژی هەر وەسا ب سەر کەڤیت‌و پێشڤە د چیت‌و ئاوازو ستران‌و ئەکتەرو شانو جهێ خو و گرن‌و ب چاڤەکێ بلند د مینن . ل سەر دەمێن بەرێ مللەتێ کورد هەر وەکی هەمی مللەتێن رۆژهەلاتێ ب چاڤەکێ گەلەك سڤك‌و نزم د نێرا هونەری‌و د گوتە « سترانبێژا » « دەلی » و ئەکتەرا « لێبوك » ..

ئەم د زانین ئەڤ هەردرو پەیڤە «دەلی‌و لێبوك» گەلەك د نزم‌و سڤکن ، یانکو مروڤەك هەگەر هاتو ئەڤ هەردوو پەیڤە پێڤە هاتن گوتن وی مروڤی چ رێزو چ بها نامینیت ل ناڤ خەلکی ، خەلك دێ یاری‌و ترانا پێکەن ، ....

د سەرهندێرا هەر ل چەرخێت بەرێ مللەتێ کورد هەمی ئەڤینداری چیروکاو سترانا بو ، هەردەم ئەڤ تشتە هەلدایەو هاندایە ... لێ چیروکبێژو سترانبێژ ب خو د بێ رێز بوون ل ناڤ مللەتی . وەکی شەمالکا و حەلیان‌و د سوتن ، جار ژ بێ رێزیێ جار ژ برسیێ‌و هەژاریێ جار ژ دەربەدەریێ لێ کوچك‌و دیوانخان هەل‌و روهن د گرن‌و گەرێن گوڤندو دیلانان د ڤەهەژاندن‌و د مەیاندن .

ئەڤەبوو دەردو کوایێت دەلی‌یاو لێبوکا ، هەر وەك هونەرمەندێ ب ناڤ‌و دەنگ محمد عارفێ جزیری ب خو گوتی .

ئەز ل گەل هەڤالێ خو یێ هونەرمەند ( حسن جزراوی ) د گەریام گوندو گوند .. شارو شار .. دول‌و نهال مە د برین تا کو د گەهشتینە کوچکەکێ یا دیوانخانەکێ ، دووشەڤ‌و دوورۆژا دا ڤیرکەینە سترانا ، ل دویماهیکێ دا چارێك دنیارێ دەنە مە هەردووکان ، دا زڤرینەڤ مالێت خو ، ....

ل ڤی دەمی‌و نوکە هیڤی‌و خوزیکێت مە ئەون هونەری جهو رێزو بهایێ خو هەبیت ل ناڤ مللەتی‌و گەلەك بهای ب دەینە هونەرمەندا وەکی خەلکێ هەمی جیهانێ وەدکەن بو هونەرو هونەرمەندێت خو ،

ل بازێرێ بەغدا مە دەرگەهێ دوو هونەرمەندا قوتاو چوینە ژورو کەڤتینە گوڤت‌و گویا ، هەر دوو دان‌عومر بوون لێ ستێرا وان هەر یا گەش بوو دلێ وان خوشە دێ بێ‌ی سحارە ل ژینا وان ، هونەرمەند ئەڤەنە .

( محمد عارف جزیری ، نەسرین شێروانی ، )

جارا ئێکێ دا بچینە جڤاتا ( محمد عارفی ) ، پسیارا ئێکێ من گوت دێ بێژمە محمد عارفی خو پێشکێشی خوێندەڤانا ب کە تە بنیاسن !! لێ پاشی من هزر کر کو بابێ کەریمی ژ هندێ حەزترەو پیتڤی هندێ نینە ، چونکە کەس نەمایە دەنگێ ڤی هونەرمەندێ مەزن‌و

بەرکەڤتی گولێ نەبۆیو نەبهیستی ، ئینا من گولێ :

**ـ بابێ کەریمی ئەگەر ب کاری بوەە ب پەیڤە کا تو روژا خو چەوا بورینی ، ئانکو دەمێ سپێدێ تو ژ خەوێ رادبیو تا کو بیتەڤ سپێدە ،**
محمد عارفی د بەرسڤا خو دا گوت :

ـ ئێ .. هـ جارێ ئەڤە تێزیکی بیستو نەه سالە ئەز ل میسلێ ، دەمێ د بیتە سپێدە ئەز ل مال دەردکەڤم د چەمە جەم هەڤالو هوگرا ئەڤم و چەمە جەم هەڤالو هوگرا ئەڤێن کو د ژیێ من دا ... ئێڤاران د چەمە پەیاسێ ل رەخ پرا میسلێ بەرێ خو د دەمە جیهانێ ، چونکە چاڤێ مە هەرێ ل دەرڤەو کەیفێ ، ئو کارێ من هە دوانزدە مەها ستران تەمبیر بوو ، ئەگەر کەیفەك شاهییەك هەبیت د چمێ جار ژی د چمە دهوکێ ئامێدیێ ئاکرێ بامەرنێ ، لێ سی باهرا وێ ژیارا من ل ئاکرێ بوو ..

**ـ ژبلی کارێ سترانانو تەمبیرێ د درێژاهیا ژییێ تەدا تە چ کارێن دیتر کرینە ؟ ؟**
ـ ل بەرێ ... ل ناڤبەرا سترانگوتنێرا من سونەتکرنا بچویکا ژی د کر ... سونەتکرن کارو کەسپا من بەرێ بو ، گوندو گوند شار بو شار ئەم د گەرِیاینو د بەررِا سترانو لاوژە ژی چێتر مە بخو د گوتن چونکە ل دەمێ بەرێ مە ستران چاك نە د زانین .. من گەلەك ستران بو خو ژ خەلکی د گرتن .. من پسیار د کر ئەڤ سترانە چاوا ؟ مقامێ هە چتوڤ تا ئەم ب درستی فێری هونەری بووین ... تا کو ئەم بووینە سترانبێژ ، تا نوکە ژی ئەز سترانا چێ د کەمو کاسێتا تژی د کەم د چمە گوڤەندو داوەتان ..

**+ ـ خوشترین ژیانا خو تەبری کەنگی بوو ل کیرێ ؟ ؟**
ـ ژییێ من [ ٢٠ ] بیست سال بوو دەمێ ئەز ل جزیرا بۆتا دەرکەڤتیمو هاتیمە دهوکێ ... حسنێ جزیری ژی هەڤالێ من بوو ... ئەم پێکڤە د چوینە کوچكو دیوانخانێت ئاغلەرو بەگلەران ئو ڤێکرا د سترین ، ڤێکرا ژیانا خو مەبرو مە حەز ژ مالێ دنیایێ نە د کر ، دەمێت مە هەمی خوشیو شاهی بۆون ، ئەگەر شاهیو خوشی نەبان ئەم لێ د گەرِیاین ، ..





**+ ـ بیرو باوەرێن تە چنە ل سەر وان دیلانو ئاهەنگو شاهیانا ئەوێ ل کوردستانێ د هێنە کرن ؟ چاوا تو هەڤپشکییێ تێدا د کەی ؟**
ـ ئەو بەرسڤا من فرێ د کەنو هەر بازێرەکێ یان هەر گوندەکێ ب چمێ سەر بانارِا ل هەمی جها د هێنە پێشیا من ، ل ڤان تشتێن تە گوتین هەمیا ئەز هەڤپشکییێ تێدا د کەم ... لێ نهو گێولێ مێزاو ئەخارنێ من نینە ... نوکە ئەز ل گەل بەڤلێن خو رادبمو د روینم چونکە ئەز پار چوومە ( تەوافا حەج )، لێ د گەل هندێ ژی ئەز نکارم سترانو لاوژا نەبێژم تا نهو ژی ئەز هەر د بێژمو دێ هەر بێژم بلا ئەز ( حەجی ) بم ـ هندی من دەنگ مایەو تا ئەڤ دەنگە د کەڤیت ، چونکە ئەڤە کارێ منە ،
**+ ـ تو هەستێ د کەی کو خەلك حەز ژ دەنگو سترانێت تە د کەن ؟**
ـ گەلەك ... ئەز هەستێ د کەم .. ئو دەمێ خەلکی ئەز خوشی د ڤێم ، ل وی دەمی ئەز هەست د کەم کو ئەز لاوەکێ چاردە سالی مە ،
**+ ـ ل سەر بیروباوەرێت تە کێ ژ سترانبێژێن کورد جهێ خو گرتیە ل ناڤ مللەتی ؟**
ـ ئەز نکارم ب بێژم فلانی...هەر سترانبێژەکی مرۆڤێن خو هەنە ..

**+ ـ ئەو سترانێن تە گوتین هەمی د فلکلورینە یان هندەك ژ دانا هندە هوزانڤانانە ؟ ؟**

ـ هەمی د فلکلورینە .. مەقامو پەستە ، تـا ئەڤرو ژی کەسەکی بو من چ نە نڤیسیەو گوتییە من : ها ب بێژە ..

**+ ـ چاوا تو فێری تەمبیرێ بووی ؟**

ـ ل بچویکاتیا من دەنگێ من خوش بوو .. وی دەمی ئەزل « مێردینێ » بووم .. زەلامەکی ل وێرێ گوتە من : مادەم دەنگێ تە خوشەو سترانا ژی د زانی تەمبیرێ د ب بەرڕا لێدە هێدی هێدی دێ فێر بی ، کەسێ ئەز فێری تەمبیرێ نە کریمە ، من ب خو زانی بەر بەرە ، چ ( دەرس ) ژی من نە خاندینەو ئـــەز نڤیســینێ نزانم ...

**+ ـ کی ژ گوند یان باژێر پتر د کەڤیتە دلێ تە ژ هەمیان خوشی تر د ڤێت ؟ ؟**

ـ ئەو گوندو باژارێ ئەزمانێ من بزانـــن .. چونکە ئەو د زانم ئەز چ د بێژم ئەز ژی د زانم ئەو چ بێژن ، ..

**+ ـ تەحلاتیو نەخوشیێن تە برین ؟**

ـ ل دەمێ گەڕیانا ل ڤی گوندی بو گوندێ هەر هوسا هندە جاران د ئەڤتینە تەحلاتیا ... ئـــەم گەلەك د گەڕیاین ئەم د وەستیاین .. زکەك تێرو دانزدە برسی .. ل ڤێگەڕیانێ « ١٥ » پانزدە سالان ل گەل حسنێ جزیری گەڕهایمەو « ١٥ » سالان ل گەل عیسی بەرواری گەڕهایمە .

**+ ـ ژیارا تە چەوانەو رەوشێ تەخوشە یان نە؟**

ئەز رازیمە ... چاڤێ م ل هندێ نینە کـــو دەولەمەند زەنگین بیم .. لێ من د ڤیبا هەر گەنجو تولاز باما .

**+ ـ ناڤی تەیێ درستو جهێ تەو زاروکێن تـە ؟ ؟**

ـ ناڤی من محمد عارفێ جزیری یە ، ئەز ل جزیرا بوتا بوویمە ، ئێك خویشك من هەیەو برا من نینن ، لێ هەڤالو دوست من گەلەك هەنە ، هەڤالێ راست ژ برا چێترە ، کوڕەكو کەچەك من هەنە ، ناڤێ کوڕێ من کەریمە خاندنێو نڤیسینێ د زانیت ، کەچا من نەخاندەڤانە (امیە) .

**+ ـ چەند ستران تەمەنەو چەند ل ئێزگێ کوردینە ل بەغدا ؟ ؟**

ـ سترانو پەستێن من « ٣٠٠ » سێ سەد بێ هەنە هەمییێ ل ئێزگەی ، (قەوانە) ژی گەلەك جارا من چێکرینە ل سالا ١٩٣٦ و ١٩٤٤ ز ل سوریێو بێروتێ ...

**+ ـ دەرڤەی ئیراقێ تە دیتییە ؟**

ـ ل گەل « عیسی بەرواری » و « گولبهارێ » ئەز چوومە لبنانیو شەهیانە مە چێکرینە ، دوو جاران ژی ئەزێ چوویمە « کوێتێ » ل سەر داخازا هندەك فەلا ل وێرێ ، ل نادیێت وێرێ مە شاهیانەکریە ، ئەزو « حسنێ جزیری » ژی جارەکێو دیچوونیـــە ئیرانێ ئەم بسترین بو ئێزگائیرانێ .

**+ ـ ل دویماهیێ ئەم حەز د کەین بزانین کـــا هیڤیو داخازێن تە چنەو دا خو بو مە ڤالا کەی ؟ ؟**

ـ ئەڤە سەرێ « ٤٠ » سالا یە ئەز د بسترمو تەمبیری لێ د دەم نهو ( متقاعدم ) و دلێ من پێ هندێ نینە ئەز ( قەسرا ) و خانیا ئاڤاکەم ، لێ دلێ من گەلەك خوشە چونکە باش د زانم چ مالو خانیو ترومبێلو گازینو نەماینە دەنگێ من لێ نەبیت !! چ جه نەمانە کوردستانێ سترانێن من نەچوبنێ !! ئەڤە بو من بەسە، چونکە ئەڤە بەلگەیە کو خەلکی گەلەك ئەز د ڤێـــم هونەرێ من بی بهایە ، ل دویماهیا ژینا خو ژیمن د ڤیا خەلکی ( رازی ) کەمو خەلك ژ من رازی بن ، خەلك سەمایێو لەیزوکێ ل بەر سازو ئاوازو سترانو پەستێن من بکەن ، خوشیا خەلکێ خوشیا منە ...

ل دویماهیێ ئەز د کارم ب بێژم هونەرێ محمد عارفی خاندنگەهەکە گەلەکا گرنگە بو دانانا بناغـــێ هونەرو فلکلورێ کوردی ، ...

دا جڤاتا هونەرمەندێ ب ناڤودەنگ ب هێلینو ب چینە جڤاتا هونەرمەندا بەرکەڤتی « نەسریـــن شێروانی » .

هەلبەت ژنا کورد د بەرێدا هەڤیشکـــی د هونەریدا کریە ... چالاکی د کاروبارێ کومەلایەتی پێ دا کریەو دەستێ خو دایەڤ مێری بو پالدانا ژیارو رەوشا بەرف باشی ، مل بمل گوڤەند گریدایە د گەل زەلامی ،

ل چەرخێن بەرێو تا نهو ژنا کورد سەربەستو ئازادتر بوو ژ ژنێن مللەتێن کنارێن خو ، چونـــکە رەوشتێن کوردا رێکەکا فرەه ل بەر سینگێ ژنان

فەڕیە . گەر بەرێ خو ب دەینە دویروکا خو دێ بینین گەلەك ژنێن بەرکەفتیو بهاگران هەبوون وەکی: حەراد ، فەدەمخێر ، زێڕین ، رەوشەن ، مەستورە، گەلەکێن دی تر ،

ل ڤی دەمی ــ نهـــو ــ پێدڤییە ژن بێتـــە هشیارکرن کو خو ب هاڤێتە د ناف قادا خەباتێ داو شەڕگەها بزاڤا تێگەهشتنێو هونەری دا ، دا کو گەرم کەتو هونەرێ کوردی ژ فەهێلانێو راوەستانـــێ رزگار کەنو پشکداریێ د هەمی رەنگێت نفیسینێ دا بکەت ــ چیروك ، خرکرنا فلکلوری ، هوزان ، رومان ت د . ــ دا رێکێ خوشکەنو ب گەهنە کەنارێن سەرفەرازیێو سەرکەفتنێ ، هیڤیدارین هەمـی کەس ب چاڤەکێ بلندو پاقژ بەرێ خو ب دەنـــە هونەرمەندا کورد وەك هەمی جیهانێ ، هەر وەسا پێدڤییە سنجو ( اخلاق ) ئولا هونەرمەندی کاری د مروڤیدا نەکەت بو کێشانو پیڤانا رێزو بهاو هونەرێ وی ، ل سەر ڤان بیروباوەرا مە چەند گوڤتوگویەك د گەل هونەرمەندا هێژا نەسرین شێروانی کرن ئەڤەنە :

**+ ــ تە بچویکاتیا خو ل کیرێ بوراندییەو چەوا ؟ ؟**

ــ ئەز خەلکێ گوندێ « شەڕنەخ » ێ مە ل کوردستانا تورکیا من شڤانی کریە ل بەر پەزی ئەز کوچەر بووم ، ل دەمێ بچویکاتیێ من چ ستران نە زانین ... کارێ من گەڕیان بوو ، . جوله مێرك ، هەلەکورامیران ، چیایێ جودی . بەحرا وانێ ، جزیرا بوّتا . شاخ ، هاڤلەر ، بێستن ، سێرنێ ، نامـــەد ( دیاربکر ) ، ئەڤە جهە هەمی من دیتینەو ئەز لـــێ گەڕیامەو د گەل بابێ خو کوچەری من کریە، بچویکاتیا خو هەمی من ل ڤان جها بـــوراندییـــە ب ژاریو نەخوشیحالی ، ..

**+ ــ تە چەوا دەست ب سترانان کرو ژییێ تە چەند بی دەمێ تە سترانا ئێکێ گوتی ؟ ؟**

ــ ژییێ من ( ١٧ ــ ١٨ ) سال بوو دەمێ من سترانا خو یا ئێکێ گوتیو ناڤێ سترانێ پەستا :

« جزیرێو جزیرێ
جزیرێ د کورێ دا »

ئو مقامێ وێ : « دەلێلێ مامەدۆ »

**+ ــ بوچی وە وارێ خو هێلاو نەگەر چ بووو هاتیە کیرێ ؟ ؟**

ــ ژ دەردێ هەژاریێو تەحلاتییێن ژیارێ مە جهێ خو هێلاو ئەز بچویـــك بـــووم دەمێ هاتینـــە دارهوزانێو قادیاو زاخوو پاشی بەغدا ، .

**+ ــ چەوا تو گەهشتییە ئێزگا کوردیو کەنگی بوو ؟ ؟**

دەمێ هاتیمە بەغدا ئەز چوومە ئێزگا کوردی ــ ب هارێکاریا سەیدا « علی مەردان » ی سالا ١٩٤٥ ێ بوو . .. تا کو سالا ١٩٧٥ ێ ئەز ( تەقاعد ) بووم ، جزیرێ ) بوو ، دەمێ ئێزگەی ــ کوردیو عەرەبی ــ ( سەعەتو ) نیڤ بوون ، سەعەتەك بو عەرەبی ، نیڤ ژی بو کوردی ، نهو سێ سەد « ٣٠٠ » سترانو پەستە من ل ئێزگەی هەنە .

+ ــ سترانێن تە گوتین هەمی فلکلورینە ؟

ــ بارا پتر فلکلورینە... یێن دی تر ژ هوزانێین جەگەرخوینیو حافظ و شێخ سەلامی نە ،...

**+ ــ ژ سترانێن خو کی ژ هەمیا تە خوشتر د ڤێت ؟**

ــ سترانەك من هەیە ژ هوزانێن جگەرخوینی یە سەرێ وێ :

« بایێ سپێدێ ل گەل دارو گولا ، ت ، د »

**+ ــ سترانبێژی ژ هەمیان پتر د کەڤیتە دلێ تـــە ؟**

ــ « محمد عارفی جزیرییەو » کە س نا گەهیتە ویو سەروکێ هەمی تەمبیرڤانایە ، ..

**+ ــ تشتێ تە نەڤێت ؟**

ــ تشتێ من نەڤێت « جداهییە » ئەڤە من گەلەك نەڤێتو حەز ناکەم هەبیت ، ..

**+ ــ تە چەوا د ڤێت بژیی ؟ یان هیڤیێن تە چنـــە ؟**

ــ ئەف ژیارا بەری نهو هەمـــی م ب تەحلیو نەخوشی بوراندییە ، م د ڤێت ژ نهو پاشڤە ببیتە تەناییو خوشی ... بژی کێماسی د گەل هەرسێ برایێت خوو خویشکا خو ل بەغدا ، ....

**+ ــ مە ژ بیرکر ب بێژین کا ناڤی تەیێ درست چ یـــە ؟**

ــ « نەسرین عەمەر ئوسمان » ە

**+ ــ تو خەلکێ «شەڕنەخێ»ە باشە «شێروانی» چەوا هات ؟**

ــ « شێروانی » نە ( لەقەبا ) منا درستە ، لێ دەمێ ئەز هاتیە ئێزگەی ل بەغـــدا کاربەدەستێ ئێزگەی ئەڤ ( لەقەبە ) ل سەر ناڤێ من دانا



# مۆسیقای جازی بێ تاو

حسن محمود رسول

مۆسیقای جاز توانی له گەڕەکی پێست ڕەشەکانەوە [ قوله ڕەشەکان ] دەست پێ بکاو پەل هەلْداو نەك تەنیا وڵاتە یەکگرتوەکان بگرێتەوە بەلْکو هەمـــوو جیهانی داگیر کرد به نەش‌و نما کردن‌و پێشخستنی ئاوازی نیو بۆ ئاوازو مۆسیقای کۆمەلە مۆسیقی یە یاخی بووە نوێ یەکان . . .

له بەر ئەوە ی‌کە ڕۆحـــی مۆسیقای جـــاز پەیوەندی یەکی بەتینی هەیە بە بوونی دانیشتوانی ڕەش پێستی وڵاتە یەکگرتوەکانەوە ، بەم پێیـــە مێژوەکەی تەنها لایەنی مۆسیقا ناگرێتەوە ، چونکە ئەو لە بەر ئەوەی کە گوزارەیەکی میللی ڕاستەو خۆیە لە خوارووی وڵات پـــەروەردە بووە ، هـــەروەهـــا ئیستیعماری کشتوکاڵ بوە هۆی دروست کردنـــی کۆیلە و بەخشنن داب‌و نەریتێکی ڕژێمی کۆمەلایەتی‌و ئابوری تەواو شەرعی ، هێندەی نەخایاند هەر ئەمە لە سالانی دواین چەرخی نۆزدەوە بووە جێگەی بە یەك گەیشتنی گەلێ بیروڕای جیاواز .

مۆسیقای جاز ، هەر لە سەرەتاوە ، مۆسیقای چوار ڕیتم ـ time ـ بووە ڕیتمی دووەم و چوارەمی جیا ئەکرێتەوە بە پێچەوانەی‌دروست بوونی کلاسیکی مۆسیقا بە گشتی ، بەلام تێکەل بوونی پەرەسەندنی ئاواز بە لە ڕینەوەکان گۆڕانکاری یەکی جیا کەرەوە دەردەخا . لە دەنگی ڕەش پێستەکان . هەژاری و بێ دەرامەتی مۆسیقا ژەنەکانی جاز ی پێســـت ڕەش هۆیەك بووە بۆ پاڵ پێوەنانیان بۆ دۆزینەوە و داهێنانی ئامرازی مۆسیقی تازە بە بەکار هێنانیان بە ئـــەو زارانەی لە بارن بۆ بەکارهێنان ئامرازی مۆسیقی تازە بە بەکار هێنانیان بە ئەو زارانەی لـــە بارن بـــۆ بەکارهێنان ، وەك تەشتی شۆرینی لە ئاسنی کوتراوە Wash bard ـدروست کراو کە لێیان ئەدان پاش ئـــەوەی کە ســـەری پەنجەکانی خۆیان بـــە قوچەکەی خەیاتی ئەگرت .

هەروەها ئەبوایە کە بە هەرزانی و ئاسایی ترین جۆری ئامێرەی مۆسیقا ڕازی ببونایە وەك ئامێری بانکو ، بەلامە ئامێرە لە مس دروست کراوەکان ، وەك جوقەی کۆرنێت‌و توبـــاو ترومبون دا لـــە ڕێگای وەرگرتن و دانەوە وە لە ئامێرە میللی‌یە هەوایی یە بە جۆشەکان پەیدا ئەکران کـــە ئەمیش بەشـــێك بوونە لەوان و دوایی پیانۆشیان بەکار هێنا وە زۆر جار مایسترۆکان (٢) پیانۆیان لە گەل تەوقیعاتـــی ئۆرگۆنی کلێـــا بەکار هێناوە .

ئەگەر وەرگرتنی گۆرانی‌یە ئینجیلیەکان جـــێ پەنجەی بنەڕەتی خۆی لە سەر مۆسیقای زنجی بەجێ هێشتبێ ، وا هەموو مانا پیرۆزەکانی خۆی لە دەست

.ۆ بە سەر کناری بەندەرەکان و کۆڵانەکانی نیو ئۆرلیانز بەجێی هێشت .

لە نیو ئۆرلیانزە وە بۆ شیکاغۆ : ـ

مەحفیس ، سانت اویس . کانساس سیتی و .... هەندێ شاری تر وێستگاکانی سەرە ڕێگای بەرەو باکوور بوون ، ناوەکانیان لکاونەتە تەك بالآی مۆسیقای پێست ڕەشەکانی کیشوەری تازە . بە چوونە ناوەوەی وڵاتە یەکگرتوەکان بۆ شەڕی جیهانی یەك پێویستەرێك بوو بۆ کۆچکاری گەورە و لێکتری بلاو بوونەوە . وە بە بڕیاری میری بە داخستنی کاباری یەکانی ستوریڤیل کە یەکێ لە هەرە گەڕەکە بە ناو بانگەکانی نیو ئۆرلیانز بوو . زۆری وەك سیدنی بیکیت Sidney Bechet ( کلارنێت ژەن و تاك سالسیفۆن ژەن ) ، وە اویس ئارمسترونگ Louis Armstrong وە کینگ ئۆلیڤر King oliver وە تومی لادنیە Tommy Ladner ( ترۆچێت ژەن ) وە کید ئوری kid ory ( ترومیون ) ، نیوئۆرلیانزیان جێ هێشت و بەرەو شیکاغۆ کەوتنە ڕێ وە لەوێ تێکەڵ بە کۆمەڵەی جاز بوون کە لە گەڕەکەکانی شارە پێست ڕەشەکانی باکووری وڵات وەدەرکەوتن، لە وانیش وەك پیانو لێدەران ئێرل هاینز Earl Hines و فاش وولر Fats Waller

وە زۆری نەخایاند کە شیکاغۆ بووە کۆڕەپانێکی بەرفراوان و ئالقەیەکی پەیوەندی گرنگ و بەبەهاو مەزن لە مێژووی نەمری بوونی مۆسیقای جاز ئەویش لەبەر هەندێ هۆ کە بە کورتی ئەمانەن : ـ

لە ناحیەی مۆسیقی یەوە ، بەرانبەری میانی سیمای مۆسیقای نیو ئودلیانز و سیمای مۆسیقای کۆیلەکان کە لە باکودی وڵات پەلی هەڵدا ، پیانو لێ ئەدرا وەك کۆکەرەوەیەك لە بەینی ئیقاع و ئاواز وە گیتار لە جیاتی بانگو بە کار ئەهێنرا وە بەیەك گەیشتنەوەی نەوەکانی کۆیلەکان و یاخود منالآنی وردە بورژوایی یەکان لە گەڵ نوێنەرانی بەرەی تازە کە لە ناوچە پیشەسازی یە کەورەکانی باکور سەریان هەڵدا . لەگەڵ ئەمانەشدا زۆربەی مۆسیقی یە پێست سپی یەکانی شیکاغۆ تێکەڵی ئەم شەپۆلە تازەیە بوون و هێندێکیان وەك بینی جودمان Benny Goodman چەند تاکێکی باشیان لە پێست ڕەشەکان راکێشایە ناو باشترین تیپی مۆسیقا

ی یانەوە . . ئەزەی گوێ بدەنـد لایەنی ڕەگەز پەرستی لەو تاکانەی کە رازی بوون بەو تێکەلآوی یەو دابێرانە بە پیر ئەو بانگەوازە وە چوون میز میزرو Mezz Mezzro ( کلارنێت ژەن )ی جازی پێست ڕەش . رازی بونێکی دا تا پلەیەك کە هەڵسا بەناو نوسی خۆی وەك بەندەیەکی خزمەتی ئەو هونەرە . وە لە باری ئابووری یەوە مۆسیقای پێست ڕەشەکانی ئەمەریکا ، بەرهەم هێنەرانی قەوان ی خرۆشاندو زۆریانی پارە داری بلند کرد ، هەروەها ڕادیۆ و پرۆگرامەکانی پەرەی سەندو هەنگاوی بەرەو پێش چوونی ناوە ئەوروپا بە گشتی بەرەو پێش هاتنی خۆ نواندنە پێست ڕەشەکانی کرد . پێش هاتێکی زۆر بێ هاوتا .

چەتەوڵەکانی ئەهریمەنە شینەکان و گۆرانیە ئینجیلیەکان : ـ

ئێمە بێ گومانین لەوەی کە مۆسیقای رەسەنی جاز سیمایەکی پیاوانی پێوە لکێنراوە . بەلآم ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە نکولی و ڕەفزی دەنگی ناسك و بەسۆزی ئافرەتی کردبێ . گۆرانی بێژ لە کۆمەڵی [ ئەهریمەنە شینەکان ] دا ناسکی دەردەخا و خۆشەویستی و دلداری یە کەی دەرئەبڕێ جا ئەگەر شێوەی شادی یاخود کۆیرەوەری وەرگرتبێ ، وە سورە لە سەر شەڕو شۆڕو سەرکەوتنەکانی و بە زمانێکی پاراو لەبەینی پالی و ئاسایی دا لێکیان ئەدات بیج بل برونزی Big Bill Broonzy کە سەرکاری کۆمەڵەی ئەهریمەنە شینە گوندی یەکانی ئەکرد تا ساڵی ١٩٥٨ یش ، ئەم کابرایە کرێکارێکی کشتوکاڵی وگۆرانی بێژی کەڕیدەو لە هەمان کاتیش دا گیتار ژەنێکی باش و بێ هاتوو بوو ... وە ئەهریمەنە شینەکانی شارەکان کە بەڕێوە بەرو سەرکاری تیی یان ئیمپراتۆرە بیسی سمیث Bessie Smith بوو . بەلآم گرانی پێکهاتنی هارمۆنی مۆسیقای ئەم دوو تیپە مۆسیقی یە هۆیەك بوو بۆ پەرە نەسەندنیان بەوقولی یەی کە مۆسیقای پێست ڕەشەکانی تیا پەرەسەندو بوو هەروەك چۆن لە گۆرانی یە ئینجیلیەکان رووی دا ، کە ئیلهام لە دین وەرگرتنی ڕووت بوو یەك تاك بەتەنیا بەڕێوەی ئەبرد،بەپێچەوانەی مۆسیقا روحی یە زنجیەکان ( پێست ڕەشکان ) کە بەبوونی کۆمەڵێ کەس بەڕێوە ئەبرا . هەرچۆنێ بێ مەسەلە ، بەلآم ئەوە لەیاد ئەکەین کە بۆ دەقی

گۆرانی‌یە ئینجیلیەکان بێژەری مەزن دەرکەوت کە لە سەروو هەموویانەوە ماهالیا چاکسون Mahalia Jackson بوو بو . نزیك بە کۆتایی بیستەکان ، پیانو لێدەرانی شاری شیکاغۆ سیمایەکی تازەو جیا کەرەوەیان بەخشی‌یە مۆسیقای ئەهریمەنەکان کە پێی ئەوترا بووجی ووچی Boogie Woogie یاخود [ گۆرانی بێژی ڕەش پێست ] ئەمەش هەر ئەو سیمایە بوو کە لە پاشدا مۆسیقای ڕۆك ئاند ڕول ی لێ هەلقولا پەلی هەلدا .

لە ژەندنی ئەم جۆرە مۆسیقایەدا دەستی ڕاست کاری لێدانی یەك بە دوای یەکدای بە پەلەیە، بە دەستی چەپیش ئیقاع ڕادەگرێ بە کۆمەل کۆمەلی کورت لە هارمۆنە ئاوازەی یەکان کە لەتەك تەوقیماتی تیژ ڕەودا بڕ ناکات . ناوی ریفس riffs بەسەر ئەو دێڕە مۆسیقی‌یە کورتانە دا کە یەك بە دوای یەکداو بێ پچڕان دێت ، ئەبرێت . پیانو لێدەر پاین توپ سمیت Pinc top Smith بو کە شێوازی بووچی ووچی داهێنا ، وە بە بەهرەترین پسپۆری ئەو هونەرە مید لوکس لویس Meade lux lewis ناو بوو کە لەئەوروپا زۆر ئەبینرا ، بەتایبەتی پاش ئەوەی لەفەرەنسا جێگیر بوو بوە ڕەزامەندی زۆربەی گەنجەکانی .

سەدەی سوینج :ـ

سوینج Swing مایسترۆی تایبەتی مۆسیقای جازە کە مۆسیقا ژەنەکانی ئەیکوێزنەوە بۆ گوێگرەکان ناونانی ئەم ووشەیە لە سەردناوە ئەگەڕێتەوە بۆ زەمانی جاز بەلام جەماوەری ئەمەریکی بەرفراوان بەکاریان هێناوە لە سەرەتای سالی ١٩٣٥ ە وە بۆ بەخشینی بەلگەنانی تیپە مۆسیقی‌یە گەورەکان Big bands وەك کۆمەلەی بێنی جودمان Benny good man لە ا پێست سپی‌یەکان بوو ، لە سەرەتای دەسپێکردنی ئەو سالەوە مۆسیقای سوینج لە گشت ئەوروپادا پەخش بۆوە زیاتر بە سیفەتێ کە مۆسیقای جازی سپی پێستەکان بوو ، خەلکی بەرەو پیری ئەهاتن وجەماوەری زیاتر ئەبوو ، ئەمە لەچاو جازی زنجیەکاندا . لە بەینی پارچە بێژەیی‌یە بێ ماناکانی دا کە هەندێ لە ئاواز دانەرانی بەکاریان ئەهێنا،لەوانیش لویس ئارسترونگ و ئیلا فیتزجرالد Ella Fitzgerald زاری سوینج و هەندێ جاریش زازو بۆ بەلگەدان بە ژەنەرانی ئەم جۆرە مۆسیقایە .

دیوك ئالنجتون : مامۆستای بێ هاوتا :ـ

دیوك ئالنجتون Duke Ellington پیانو لێدەر و مۆسیقا دانەر ـ مؤلف ـ ی لێ هاتوو و سەرۆکی تیپیکی مۆسیقی (ئۆرکەسترا) پاش ماوەیەکی کورت توانی سیماو هێزی دەنگی کەسایەتی بەپێز بخاتە سەر تیپە مۆسیقی‌یەکەی ، لە بەر ئەوە ئەبینین کە دانان و ریك خستنی مۆسیقی ، گەیشتنە پلەیەکی بێ هاوتای یەکسان ، ئەویش لە سەرەتای دەسپێکردنی شێوازی (جەنگەل)ە وە کە لە سی‌یەکاندا سەری هەلدا تا تۆژینەوە ملحمیێکان کە هەندێ لە پارچە مۆسیقی‌یەکان واتای خۆیان پێ دەبەخشن وەك کۆنشرتۆی [ فشلی کوتی و سەرجی شین ـ ١٩٤١ ـ ] یان [ ڕەش و قاوەیی و بێجی ] کە سە مفۆنیایەکی ڕاستەقینەی پیا هەلدەر بەپێست ڕەشەکان‌بوو . کاتێ پیاوانی جازی ئەوروپا خۆیان دی‌یەوە کە دورە پەرێزن لەو کانیاوەی کە سەرچاوەی ئیلهامیان بوو . زۆر بە گەرمی یەوە پاشگەز بوونەوە و گەڕانەوە بۆ ئەو باسانەی کەپێش شەڕ دانرا بوون یاخود هاتن‌و چەند داهێنانێکی بە برەوی تریان داهێنا هەروەکو چانجو داینهارت Django Reinhardt کە سەرکاری پێنجینیەکانی ( یانەی گەرم ) ی لە فەرەنسا ئەکرد ، هەمان ڕێبازی هەلبژارد . دوا بەدوای شەڕي دووەمی جیهانیو کۆتایی هاتنی ، سەدەی سوینجیش کۆتایی پێهات ، بەلام لەئەوروپادا ماوەیەکی تریش درێژەی بە مانەوەی خۆی دا ئەویش فەزلی ئەگەڕێتەوە ئەو تەشکیلاتە گەورانەی کە کاونت بازی Count Base ( پیانۆ ) ، یان چیمی لونسفورد Jimmy Lunce ford ( کلارنێت و ساکسۆفۆن ) ، یا دیوك ئالبختون (پیانۆ) پێکیان هێنا ، ئەم تەشکیلاتانەش لە تاك ژەنەرانی دا جیائەکرانەوە وەك لە ئاستی دیکس ستیورات Rex Stewart وە کوتی ویلیامز Cootie Williams (ترۆچێت) ، کولمان هوکنز Colemon hawkins و بین وبستر Ben Webster و چونی هودجز Johnny hodges ( ساکۆفۆت ) ، دیکی ویلز Dicky wells و تریکی سام ناتتون ( ترومبۆن ) ، تشیك دیب Chick webb و بیج سید کاتلیت Big Sid catlett

مقارع ) ) . له واقیعـــدا مۆسیقای جـــاز بووه مۆسیقای نووسراوه و زیاتر ئالۆز ، لەبـــەر ئەوه خوێندنەوەی سەرپێیی بە کۆمەڵ کەس کە ووریا بوونەوەی ئۆرلیانزی پێ جیا ئەکرایـەوە ، بۆ ئـــەو تیپانەی کە لە پانزه مۆسیقی ژەن زیاتر بوون نـــه دەلوا . بەڵام خوێندنەوەی سەرپێی تاك تانەمڕۆش بەردەوامە وە هەر تاك ژەنێ بـــه دەوری خـــۆی کۆرسێ بە رێوە دەباو جلەو بۆ ئیلهامات + بابەتـــه تەوافقی و ئیقاعی یەکە بەر ئەدا کە تاکەکانی تـــری تیپەکە پێشکەشی ئەکەن بە درێژایی ئەو کانەی ئەو تاکە دەوری خۆی ببینێ . لویـــــس ئارســـــترو نکیش یەکێ بووە لەوانەی کە زۆر متمسك بوو بەو تەشکیلاتە بچووکەی کە لەپێنج یان حەوت مۆسیقی پێك ئەهات کەپێیان ئەوترا ( پێنجی گەرم ، حەوتی گەرم ) .

بەر سیلەو هەنجیری بۆگەن : ـ

ئەو شۆڕشەی ئەم بەرەیە بەرپایان کرد بووە شکاندنی ناحیەی ئیقاعی و دڕاندنی ئاواز وە زۆر جار دەنگـــی پەڕگر و هەندێ جار تیژ ڕەویان ئەخستە ناو وە زۆر جاری تر لە ئاواز بۆ دانانی دائەمالرا و لە بچـــووك ترین بڕیارێك کە بدرابایە سەرپێچی ئەکرا . لـــه دەوری دیـــــزی چیلیســـــین Dizzy gillespie (ترۆمپێت ژەن) زۆر مۆسیقی تـــر گرد بوونـــەوە لەوانیش کینی کلارك ( مقارع ) ، تیواونیس مونـــك (پیانو) ، شارلی پارکو ( ساکسۆفۆت ئالتو ـ اعلی طبقه ـ ) ، ئەم سیانە لە کەڵە پیاوانی بواری بیبوب be—bop ن ، بوب جۆرە مۆسیقایە کە ناوەکەی لە ئاوازە بە پەرۆشەکانەوە وەرگیراوە و دیـــزی چیلیسپی زۆر لە پارچە مۆسیقی یەکانی خۆی پێوە سەرف کردووە . بە دەرچونی یەکەم قەوانی کـــه [ شەوێك لەتونس ، جیهانی بالندە ، گەڕانەوە ] بوو گیژاو و گەردەلوولی پڕ لە کۆسپو سیخناخ و ڕۆژان بەردا بوو تا زۆری نەخایان گرو پریشکی چۆنـــاو هاورێیانی و دۆستانی ئەم جۆرە مۆسیقایە تا لـــه ئاکاما لێکیچڕان و بوونە دوو بەرە بەرەی بەرسیلە کە لایەنگرانی بوب بوون وە بەرەی هەنجیری بۆگەن کە کۆمەڵێکی کلاسیکی ئینکاری پەیوەندی پتەوی میانی بوب و جازیان ئەکرد . کاتێ کە شارل بارکر ساڵی ۱۹۵٥ کۆچی دوایی کرد . ئەو سیانە ، دوو ساڵ پێش ئەو ڕووداوە لێکتری جیا ببوونەوە ، بەڵام ئارت بلاکی Art blackey و هاورێیانی ئەو میراتەی پەیام نێری جازیان زیندوو کردەوە .

کالیفۆرنیای بوژاوە : ـ

مۆسیقی بچکۆلە سەریان هەڵدا کە زۆربەی ئەندامانی لە سپی یەکان بوون ، ئەمانە بە دەوری ستان چیتز Stan getz ( ساکسوفون تینود ـ الطبقـــه الثالثه ـ ) و چیری مولیجـــان Gerry muligan گرد بوونەوە و جۆرێکی نوێی لێدانی مۆسیقیـــان هێنایە ئاراوە کە بە سوولیی و هاوسەنگی و شتومال کاری و بوژاندنەوەیی جیائەکرایەوە ئەم جۆرە نـــوێ یەی لێدان پێیان ئەووت جازی بوژێنەو کە دوایی ناونرا کناری ڕۆژ ئاوا ، ئەویش لە بەر دەرکەوتنە جوگرافی یەکەی ، وە هەر بە هەمان گیانەوە چوارینەکانی جازی کە لە ڕەشەکان پێك دەهاتن سەرکەوتنی خۆی وە دەست هێناو لە گـــەڵ یەکەم هەنگاو نانیان بـــۆ بەستنەوەیەك کە مەبـــەستی یان بـــه جەماوەرو تەوقیماتی سوینجە وە تێر و تەسەل کردنی جازی ڕەسن ـ الاصلی ـ بووە بە یارمەتی هاو گونجان و لێکتری بەستنێك کە ڕاستەو خۆ سیما کلاسیکی یە ئەورووپی یەکە وەرگیرابێ . لە تالەکانی ئەم بوارەش چون لویس (پیانۆ) و میلت جاکسون (اهتزازات) کە جووت دانەری مۆسیقی و ستونی پتەوی ئەم جـــۆرە تەشکیلاتە بوون .

جازی سەربەخۆ : ئایا ئەمە ڕزگار بوونە یاخۆ بەستنەوە ؟!

کارتێکردنی هەندێ لە وڵاتانی ئەفرۆ ئاسیاوی ـ ئەفەریقی و ئاسیایی ـ کە حوکمداریەتی خەیان وە دەست هێنا لە کۆتایی یە نجاکاندا ، یەکێ بوو لـــه هۆ گرنکەکانی زیندوو بوونەوەی گیانی شۆڕشگێڕی لەلای زۆربەی گەنجەکانی پێـــت ڕەش و هەســـت کردنیان بە بەش خوراوی یانو هەوڵدان بۆپـــی ویستان بۆ خۆ جیاکردنەوەیـــان لە سپی پێستی چەوسێنەر ، لە بەر ئەوە لە زۆربەی ئەو چالاکیانەی بەشداریان ئەکرد کە لە مەبەستی بە کارهێنانـــی هێزو عونفە بۆ ڕزگار کردنیان ، وە زانیاریان بـــه دژواری ژیان لە کۆمەڵگای سەرمایەداری ئەمەریکـــی و دەوری تەکنۆلۆژیای تازە کە زیاتر دژ بە مـــەردم بەکار ئەهێنرێ و شۆڕش گەلی ڤیتنامی و ترس لـــه شۆڕشگێڕانی فەلەستین و قەبەی کارەساتی گیرو گرفتی فەلـــەســـتین دوای شـــەڕی ۱۹٦۷ ،

دەنگدانەوەیەکی ڕامیاری مەلوس تازەیان ئاخنیە نلو جاز ( شتیتازە ) ، کە تیایدا سەرپێیزالە بەسەر دەفو تەوافقی ئیقاعدا . ئارش تسبب ( ساکسوفون تینور ) و سیسل تیلور (پیانو) و ئارنیت کولمان ( ساکسوفرت ئالت ) دروست کراو لە پلاستیک پالەوانانی ئەم بوارە و توانیان بیگەینە ئەو پەری مەبەست

جازی بەتاو :

مۆسیقای جاز بە زنجیرێکی لێك نەپچراو و درێژی بێ کۆتایی دائەنرێ ، وە نابێ وابزانین کە لەکۆتایی نزیك ئەبێتەوە،هەروەها بە وەدەرکەوتنی ری شارلز Ray Charles نازناو بە زانا بەلگەیەکە بە دەستەوە بۆ ئەوەی کە مۆسیقای جاز تا ئێستاش لە توانای دا هەیە بگەڕێتەوە بۆ سەرچاوەکانی دۆخی دێرینی ، پێش ئەوەی ئالقەیەکی تر بچێتە سەر مێژووی ئەو زنجیرەیە ، بەلام بارو دۆخی ئێستای ناهەموارە زەمینەش بۆ وەدەر کەوتنی چەند ئەستێرەیەکی گەشەداری تر خۆش نی‌یە ، وە دوور نی‌یە کە هۆ بێت بۆ پێ ڕاوکە لەجێی خۆی مۆسیقای جاز لە دروست بوونو سەر هەلدانیا مۆسیقای سەما بوو ، بەلام باج سەندنو هەندێ ئیلتیزاماتی قورس بووە هۆی داخستنی دەرگاکانی زوربەی سالۆنەکانی سەماکردن ، بەلام کاباری یەکان و تیاترۆخانەکانی شەوان بەسێیی واتا ـ پیانۆ ژەن ـ ڕازی نەبوون ، تا ئەمانیش وردە وردە بەرەو وون بوون ئەچوون ، لەبەر ئەوە ئەو شوێنانەی کە سەمای تیا بکرایە مایەوە سەرقەوانو تۆمارگاکانی ستریۆ بەوە زۆربەی مۆسیقی یە بلیمەتەکانیان ناچار بوون وازبهێننو پەنا بەرنە بەرئیشی تر بۆ بەردەوامی ژیان.وەیەکێ لەوانەی کە زۆر گرنگی دا بەو بارە ئالۆزە میشیل پیرین بوو کە ووتویەتی ( تیپە مۆسیقی‌یە گەورەکان ، ئەوانە تا ئێستاش ئیش ئەکەن ، زۆر کەمن ( ئالینکون و بازی ) لە شەش مانگ زیاتر لە سالێکدا ئیش ناکەن لە کاتێکدا کە نموونەی ئەم جۆرە تیپانە لەوەو پێش شەو بۆێرو پشودانیان نەبوو ، کەچی ئێستا بەس شەوانی پشووی هەفتەکان و هەندێ موناسەباتی وەك جەژنەکانو نومایشی مۆسیقی و ... ئەمانەش ئەوەندە زۆر نین و مۆسیقی‌یەکانیش ئەوەندە نەدەخرۆشان وەك لە بوونی سەما کەرانی تێکەلاو دەخرۆشان و هەروەها جولانیانو بەشداری لە ئیقاعە مۆسیقی‌یەکە ئەکرد . ) ئەم بارە ئالۆزو دژوارە بەردەوامە مایەوە تا گەیشتە پلەیەك کە ڕێکخراوەی نهێنی پەیدا بوون ، جاك ئەندریە ناوی نابوون ـ مانیای جاز ـ کە ئەویش مەبەستی لەو ڕەخنە گرانەی کە بەڕێوەبەری هونەری کارگەکانی قەوان و دەرهێنەری لە ڕادیو تەلەفزێون وریکخەرەکانی ئاهەنگە مۆسقی‌یەکان و بەڕێوەبەری گۆڤارە تایبەتی‌یە کانی ئەم لایەنە بوون ، وەئەم ریکخراوە نهێنانە جیاواز لە میانی جازی دروست و جازی نا دروست نەدەکرد ، دیارە کە ئەم گەڕە لاوژەیە زیاتر لە خزمەتی نا دروست دایەو ڕێژەیەکی زۆریش لە جەماوەری ئەسلی ڕەسەن ڕادەکێشێتە ناو ئەو وێنە کاریکاتێریانەی کە ئو سلوبی هالیدای Hallyday و پرسلی Presley تەسیلی ئەکەن .

بەلام نابێ هێندە گوێ بدەینە ئەو فەرمانانەی کە بەسیلبی و بێ گوێ پێ دان ئەبێت بە تووشی مۆسیقای جازەوە . چونکە تەمەنی جاز لە سێ چارەکە سەدە تێ ناپەڕێ ، ئەمەش . بە تەمەنێکی درێژ دانانرێ بۆ مۆسیقایەکی زیندوو . لە کۆتایی‌دا بۆچوونی هیوج باناسییە Hugues Panas دەخەینە ڕوو کە روتوویەتی [ زۆر جار هەست ئەکەین کە مێژووی جاز هێشتا لە سەرەتایدایە ] .

پەراوێز :

١ ـ ڕیتم = زمن وە زەمەنی مۆسیقی بریتی یەلە : ـ

ڕۆند ، بلانش ، نوار ، کروش ، دبل کروش ، تربل کروش ، کواتر بل کروش .

٢ ـ مایستر = ضابط الایقاع

٣ ـ گۆڤاری الهدف ... ٢٠٠ ژامرە ٢٥ سالی یەك لا ٦٨٥ ـ ٦٩٠ .

# سەرەباسێکی کۆمپیوتەر

حکیم کاکەویس

وەکو هەموو ئامرازێکی تر ، وەنەبێ کۆمپیوتەر بەم شێوە بەربڵاو و فراوانەی ئێستا داهێنرابێت و وەکو ئەم شێوەیەی ئێستا بەکار هێنرابێت یا بەم فراوانیە سوودی لێ بینرابێت. بیر و بۆچونی تەکنیکی بۆ مەبەستی ژماردن و کۆکردنەوە و ئەو جۆرە کارانە دەمێکە هەیە و وردە وردە پەرەیسەندوەتا گەیشتۆتە ئەم شێوە پێشکەوتوەی ئێستا . وای لێهاتووە کەشتیە ئاسمانێکان بەڕێوە دەبات و کاری جۆراو جۆری پێئەنجام دەداو دەیگەڕێنێتەوە بۆ ئەوشوێنەی کەداهێنەری کەشتیەکە دەیەوێ ئەمەش بەپێی ئەو پرۆگرامەی بۆی دانراوە .

ئەوڕادە زانیاریەی کەلەبارەی کۆمپیوتەرەوە هەمانە دڵۆپێکە لەدەریایەك لەگەڵ ئەوەشدا نابێ ئەوڕادەیە نەگۆڕین و لەپەلوپۆ بکەوین و دەستەوسان بوەستین و بڵێین وازلێهێنانی چاکترە لەکاتێکدا کە ڕێژەی زانیاری گەلان بەرەو پێشتر دەڕواو بۆ زۆر مەبەستی زانیاری و ئابوری کۆمپیوتەر بەکار دەهێنن و بەشی تایبەتی بۆئەم زانستە بەربڵاوە لەزانکۆو کۆلیژەکان دەکەنەوەو زۆر لەقوتابیان ڕووی تێدەکەن و خوێندنی باڵای تێدا تەواو دەکەن . ئەی دەبێ ئەوکەسانەی تەنها ناویان بیستبێ چۆنی بیر لێبکەنەوە ! تەنانەت زۆربەی ئەوکەسانەی کاریشی تێدا دەکەن و زۆریشیان لەسەری خوێندوە ، لەسنوری کارکردنی کۆمپیوتەر بێئاگان و نازانن ئەمڕۆ چ نهێنیەك لەجیهانی کۆمپیوتەردا دۆزراوەتەوە .

لەبەرئەوە هەوڵدەدەم کە بەساکارترین شێوە بچمە ناو باسەکەوە بۆئەوەی ئەوکەسانەی هیچیشیان لەم بارەیەوە نەزانیوە شتێکی لێحاڵی بن و هیواداریشم کەتێدا سەرکەوتووبم .

بێگومان کۆمپیوتەر ئامرازێکی بێگیان و بێهەستەو چاك و خراپ ، ڕەش و سپی لەیەکتر جیاناکاتەوەو بەگوێرەی ویستی نوسەری پرۆگرام کاردەکات . کارکردنی ڕێکوپێك یا هەڵە پەلە بۆ نوسەری پرۆگرامەکە دەگەڕێتەوە . ئەگەر دوو پرۆگرام بۆیەك مەبەست بنوسرێن ، ڕەنگە یەکێکیان زوو ئەنجام بەدەستەوەو بدات و ئەوی تریان درەنگتر ، هەریەکە لەو پرۆگرامانە بەگوێرەی ویستی نوسەرەکەی کار دەکا تەنانەت ئەو ویستە هەڵەش بێ .

بۆنمونە : ( یەك لەگەڵ دوو دا کۆبکەرەوەو ئەنجامەکەی لەگەڵ سێدا کۆبکەرەوەو ئەم ئەنجامەش بنوسە ) یا ( یەك و دوو و سێ کۆبکەرەوە ئەنجامەکەی بنووسە ) .

ئەو دوو ڕستەیەی سەرەوە هەردوکیان ڕاستن بەڵام دوەمیان بەجێترە لەبەرئەوەی وشەی کەمتری تێدا بەکارهێنراوەو هەمان ئەنجامیش بەدەستەوە دەدا . هەروا لەخوێندنی ئاسایدا یەکەمیان لە دووەمیان زووتر تەواو دەکرێ، خوێندنەوەی ڕستەی یەکەم پێویستی بەکاتێکی زۆرتر هەیە لە دووەم . ئەی ئەگەر ئەو دوو ڕستەیە ژمارەی زۆرتریان تێدا هەبێت ؟ . بێگومان کاتی زۆرتری بۆخوێندنەوە دەوێ و جیاوازیەکی زۆرتر لەنێوان خوێندنیاندا دەبێت (١) .

لەبەرئەوە ئەگەر نوسەری پرۆگرام ڕستەی دووەم بەکاربهێنێ یارستەیەکی لەوەش ساکارتر ئەوا پرۆگرام نوسێکی چاکەو کۆمپیوتەریش بەزوویی کارەکەی بۆ ئەنجام دەدا . خۆئەگەر هەرکامێکیان بەکاربهێنرێ کۆمپیوتەری لێوەجواب نایەت و کارەکە ئەنجام دەدا ، تەنها لەکاتی ووتو وێژی هەڵەدا کارەکە ئەنجام نادات و وەجواب دێ. بابڵێین زەلامێکی دەستکردی بێهەستو هۆش کارمان بۆ ڕادەپەڕێنێ و هەموو ئەو ووشانەمان لەمێشك دا ( MEMORY ) تۆمار کردووە کە پێویستیمان پێهەیە ئەگەر داوای لێبکرێت لە سیروانەوە سەرەنێك (٢) ناو بهێنێ ، بەهەموو ئەو ووشانەدا دەچێتەوە کە لەمێشکیدا تۆمار کراوە هەتا دەیاندۆزێتەوە ئەوسا دەچێ سەرەنەکە لەسیروان وەردەداو دەگەڕێتەو . ئەگەر یەکێ لەو ووشانەی لەمێشکدا نەبێ وەجواب دێتەو دەڵێ : ( لەو ووشەیە ناگەم ) . بێگومان دەبێ ڕستەی ( لەو ووشەیە ناگەم ) لەمێشکیدا هەبێتەو بۆی دانرابێ کەی بەکاری بهێنێ .

ئەگەر بەو زەلامە دەستکردە بڵێین : ( سەرەنێ



وێنەی (١)

ئاو بهێنە ) دەبێتە ڕستەیەکی ناتەواو چونکە نازانێ لەکوێی بهێنێ لەبەر ئەوە کارەکە ئەنجـــام نادات . ئەگەر پێی بڵێین : ( سەرەنێك ئاو لەسیروانەوە بهێنەو بیکەرە کوپەکەوە ، ئەگەر کوپەکە پڕ نەبوو سەرەنێکی تر لەسیروانەوە بهێنە ... )

لێرەدا کارەکە بێکۆتایی‌و بێئەنجـــام دەبێت ، هەر دەڕوات سەرەنەکە لە سیروان وەردەداو بەرەو کوپەکە دەگەڕێتەوەو سەرنەکە خوار دەکاتەوەو بەرەو سیروان دەڕواتەوە ...

هەتا کوپەکە پڕ نەبێت ئەم لەهاتو چۆی خۆی ناکەوێ ، بەڵام کوپەکە پڕ نابێ کەوابو ئەویش هەتا هەتایە لە هاتوچۆدا دەبێ‌و بەبێ بەرهەم خەریکی ئەم بەزمە دەبێت . ئەم جۆرە کارە گێژاو ( الحلقـــە المفرغە ـ LOOP ) ی پێ دەوترێ

ئەگەر پێی بووترێ : ( ئاوەکە بخـەرە ســـەر ئاگرەکە ) . مافی خۆیەتی بچێ ئاوەکە بڕژێنێتە سەر ئاگرەکەداو بیکوژێنێتەوە . دوایی پێی بووتــرێ : ( کەی پلەی گەرمی ئاوەکە گەیشتە ٨٠ دایبگرە ) . یا دەڵێ : ( ئاوی چی ! ) یا بۆخۆی لێی دەوەستێت‌و چاوەڕوانی گەرم بوونی ئاوەکە دەکا کە هەرگیز گەرم نابێ .

خۆ ئەگەر کاری ڕێك‌و پێك‌و ئەنجامی چاکمان لەو زەلامە بوێ ئەوا دەبێ ووتو وێژی ڕێك‌و پێك‌و بەجێی لەگەڵدا بکەین ، لەجیاتی سەرەن مەنجـــەڵ باشتێکی لەو بابەتە بەکاربهێنین بەمەرجێك ئـــەو ئامرازەی دەمانەوێ ئەوزەلامـــە بـــەکاریبهێنێ لەبەردەستیدا هەبێت‌و ناوی بۆ دانرابێ . لەم حالە یادەچێ لەسیروانەوە بەمەنجەڵ ئاو دەکێشێتەوە هەتا کوپەکە پڕ دەکا ، ئەوسا چاوەنواڕی فەرمانی تر دەبێ.

بەهەرچی زمانێك خۆمان بمانەوێ دەتوانـــین لەگەڵ ئەو زەلامە دەستکردەیا بدوێین ، بەو مەرجەی ئەوشتانەی بەکاری دەهێنێت لەبەردەستیدا بێت‌و ناوەکانیشیان لەمێشکیدا تۆمار کرابێت . دەتوانین سەرەنێکی لەلا دابنێین‌و ناوی چاویلکە یا دیلوانی(٣) لێبنێین ، لەم حالەتەدا لەووشەی سەرەن ناگات‌و کەی ووشەی چاویلکە یا دیلوانمان بەکارهێنا ئـــەو بەکـــەر دەست دەداتە سەرەنەکە .

لە نوسینی پرۆگرامدا چەند زمانێکی جیاواز هەیەو ئەمانەی خوارەوە بەزۆری بەکاردەهێنرێن :

١ ـ فۆرتران FORTRAN
٢ ـ ئەلگۆل ALGOL
٣ ـ کۆبول COBOL
٤ ـ ر. پ. ج R.P.G

یەکەم‌و دووەمی ئـــەو زمانانە بۆ کارو باری زانـــستی‌و بیردۆز بەکاردین‌و سێهەم‌و چوارەمیش بـــۆ کارو باری بازرگانی‌و سەرژمێرو ئابـــوری بەکـــار دەهێنرێن .

بێگومان ئەو ووشانەی لەهـــەر زمانێکـــی کۆمپیوتـــەردا بەکار دەهێنرێن ژمارەیەکـــی دیاری کراوەو دەژمێردرێ‌و کۆتایی پێ دێ ، بەڵام ژمارەی ئەوپرۆگرامانەی بەو زمانە دەنوسرێن کۆتاییان پـــێ نایەت . مرۆڤ چەنـــدی بوێ دەتوانێ پرۆگرام بنوسێت‌و کۆمپیوتەریش بەپێی ئەو پرۆگرامانە کاری بۆ دەکا . هەروەکو چۆن ژمارەی ووشە لەزمانـــی ئادەمیزادا کۆتایی پێدێ بەڵام ژمارەی ڕستە کۆتایی پێ نایەت چونکە ئەگەر ژمارەی ڕستە لەزمانـــی ئادەمیزادا کۆتایی پێ بێ ئیتر دەگاتە ڕادەی (الکمال). ژمارەی پرۆگرامیش کاتی کۆتایی پـــێ دی مرۆڤ پێویـــستی پێ نەمێنێ‌و بگاتە ڕادەی (الکمال) کە ئەمەش نەگونجاوە .

بۆ نوســـینی پرۆگرام ڕێچـــکە ( الخطوط الانسیابیة — FLOW — CHART ) دەکێشرێ‌و بەکوێـــرەی ئـــەو ڕێگەیـــە پرۆگرامەکـــە دەنـــوسرێ . لەپاشـــان ئـــەگـــەر هەڵەو نارێکی لەکاری یا ئەنجامـــی کارکردنـــی پرۆگرامەکەدا هەبێت ئەوا نووسەرەکەی بەڕێچکەکەدا دەچێتەوەو هەڵەکانی ڕاست دەکاتەوەو لەپاشـــان بەگوێرەی ئەو ڕاســـتکردنەوەیـــە نوســـینی پرۆگرامەکەش ڕاست دەکاتەوە .

**نموونە :**

چەند پۆلیسێك لۆریەکی گەورەیان پێیـــەو لەسەرە ڕێیەکدا ڕاوەستاون . هەرکەسێ بەویـــدا تێبپەڕێ داوای پێناسی لێدەکەن ، ئەوەی پێناسی پێنەبێ سواری لۆریکەی دەکەن‌و ئەوەی پێیبـــێ

دەڕوات . وێنەی (١) ڕێچکەی ئـــەم نموونەیـــە وسینی ڕێچکەکەش لەپرۆگرامدا بەم شێوەیە دەبێت:
ئەگەر پێناست پێیە سواری لۆرێکەبە ئەگینا بڕۆ .

یا : ئەگەر پێناست پێیە بڕۆ ئەگینا ســواری لۆرێکەبە .

وێنەی (١) تەنها یەکێ لەو دوو ڕستەیەی بۆ دەنوسرێ کەیەك واتا دەدەن بەدەستەوە . خۆ ئەگەر ڕستەی ( ئەوەی کە تەمەنی لە ١٨ ساڵ کەمتربــێ پێناسیان لێناوێ ) بخرێتە سەر نموونەکە ئەوســا ڕێچکەی وێنەی دووی بۆ کێشرێت و لەپرۆگرامەکەدا بەم شێوەیە دەنوسرێت :

ئەگەر تەمەنت لە ١٨ساڵ کەمترە یا پێناست هەیە خوات لەگەڵ ئەگینا سواری لۆرێکەببە .

یا : ئەگەر تەمەنت لە ١٨ ساڵ کەمترە خوات لەگەڵ ئەگینا ئەگەر پێناست پێیە سواری لۆرێکە بە ئەگینا بڕۆ .

لەجێگای ئەگینا لـــە COBOL ووشـــەی ELSE بەکار دەهێنرێت .

ئەگەر لەڕستەی [ ئەگەر تەمەنت لە ١٨ ساڵ کەمترە یا پێناست هەیە خوات لەگەڵ ئەگینا سواری لۆرێکە ببە ] تەنها ( وە ) لەجێگای ( یا ) دابنرێت چی ڕوو دەدا ؟ . بێگومان ئەوانەی تەمەنیان لە ١٨ ساڵ زۆر ترە دەگیرێن جا پێناسیان پێ هەبێ یا نەیێ ، ئەوانەی تەمەنیان لـــە ١٨ ساڵ کەمترەو پێناسیان نیە دەگیرێن . لێرەدا گرنگی ( منطق ـ LOGIC ) بـــەدی دەکـــرێ ، نوسەری پرۆگرام تەنها (وە) لە جێگای ( یا ) دابنێ ئەنجامی کارەکە زۆر دەگۆرێ .

ئەگەر بەشێوەیەکی ڕێك و پێك ئەم نموونەیەی سەرەوە دەر نەبردرێ و ڕێچکەی ڕێك و پێکی بـــۆ نەکێشرێ ئەوسا هەرچی ژن و منداڵ و پیرو شەل و کوێری بێ پێناس بەوێدا تێبەڕن دەگیرێن و هەڵەو تاوانیش هی ئەوکەسەیە کە فەرمانەکەی بەوشێوە نارێکە دەرکردوە . دەتوانین هەمووکارێك بکەینە سێ بەشەوە :




وێنەی (٢)




وێنەی (٢)

١ ـ داهات ( مدخولات ـ INPUT )
٢ ـ ژماردن و کارکردن ( PROCESSING )
٣ ـ ئەنجام ( OUTPUT )

لەگرتن و بەرەڵاکردنـــی خەڵکـــی لەلایـــەن پۆلیسەکانەوە بەم شێوەیە دابەش دەکرێ :
١ ـ داهات ـ ئەو زەلامانەیە کـــە بەرەوڕووی پۆلیسەکان دێن .
٢ ـ ژماردن و کارکردن ـ پۆلیسەکانە
٣ ـ ئەنجام ـ ئەوانەی دەخرێنە لۆرێکـــەوەو ئەوانەی دەڕۆن .

کارکردنی کۆمپیوتەر بەهەمان شێوە دابـــەش دەکرێ ـ وێنەی (٣) . ئەگەر وەســـتایەك و دوو کرێکار خەریکی دروستکردنی دیوارێك بن ، خشت و قوڕو خۆڵ و بەرد دەبنە داهات و وەستاو کرێکارەکان دەبنە ژماردن و کارکردن ، دیوارەکـــەش ئەنجامە . ئەگەر ئەم سێ کەسە بەتواناو بەهێزبن و بەگوێرەی پرۆگرامێکی دوور لەهەستی مرۆڤایەتی کاربکـــەن و داهاتی باشیان هەبێت بەزووترین کات و بەجوانترین شێوە کارەکە ئەنجام دەدەن . داهات و ئەنجـــام هەمیشە لە ژمارەو ڕەنگ و سوکی و گرانی و ئەم جۆرە شتانە پێك دێن و ژماردن و کار کردنیش پێویستی بـــە مێشك ( الذاکرة — MEMORY ) هەیەو هەموو داهات و ئەنجام لەژێر دەســـەڵات و ڕێکیفی خاوەن مێشکدا دەبن .

داهاتی کۆمپیوتەریش لەســـەر شـێوەیەك یان زیاتر لەمانەی خوارەوە دەبێت :
١ ـ کارتی کونکراو PUNCHED CARD
٢ ـ شریتی موگناتیسی MAG. TAPE
٣ ـ قەوانی موگناتیسی MAG. DISG
لەگەڵ هەندێ شتی‌تر کە کەمتر بەکاردێن .

ژماردن و کار کردنیش بـــەگوێرەی داواکردنـــی پرۆگرام و بەپێی چەندو چونی داهات ئەنجام وەدەست دێنێ .

ئەنجامیش لەســـەر یەکێ یا زیاتر لەمانـــەی خوارەوە تۆمار دەکرێ لەلایەن کۆمپیوتەرەوەو کۆتایی بەکاری پرۆگرامەکە دێ :

١ ـ چاپ کراو PRINTED
٢ ـ شریتی موگناتیسی
٣ ـ قەوانی موگناتیسیو هەندێ شتی تر ـ

**پەراوێزەکان :**

(١) جارێکیان پرۆگرامێك بۆ ئەنجامی کارێك نۆ سەعاتی خایاند ، لەپاشان پرۆگرامەکە سەرلەنوێ نوسرایەوەو هەمان کاری بەیەك سەعاتو نیو ئەنجام دا .

(٢) لەهەندێ شوێنی کوردستان سەرەند بەکار دەهێنرێتو لەهەندێ شوێنیتر سەرەدو لەناوچەی کرکوك ( سەرەن ) ی پێ دەڵێن .

(٣) دیلوان : جۆرە دەرزیەکە لەهی درومان گەورە ترەو لە سوژن بچوکترە .

(٤) نیشانەی پرسیارەو تەنها دوو وەڵامی هەیە ( نا ) یان ( نا ) .
نیشانەی کارکردنە وەکو : بنوسە ، بخوێنە ، برۆ ، کۆیبکەرەوە ، دابەزە ، ....

**سەرچاوەکان :**


Honeywell Information Limited.
HONEYWELL EDVCATION STUDENT
STUDENT HANDBOOK
Introduction Computer. London W6 YX93
Gilversleevc. ComputerData Precessing and RPG Progromming Englewood Cliffs, N. J.
NCR [NATIONAL CASH REGISTER Co.] NCR century COBOL student Text.
NCR NCR Centry B1 Operating System.
NCR NCR century COBOL


لەگەڵ هەندێ لەو موحازەرانەی وەرمانگرتوە یانوسراونەتەوە لەلاینو کۆمپیوتەرزانە عیراقیو بێگانەکانەوە .

**تێبینی :** لەبەر ئەوەی زۆربەی ئەو سەرچاوانەی کە سودم لێبینیوەو تایبەتیە بەکۆمپیوتەری (NCR) ەوە زوو زوو تازە دەکرێنەوەو دەگۆڕدرێنو چاپ دەکرێنەوە سالی چاپکردنیانم نەنووسیوەو لەهەموو ئەو شوێنانەی ئەمجۆرە کۆمپیوتەرە هەبێت ئەم سەرچارانە هەیە .

---

هاونیشتمانی بەڕێز ،
بەشداری کردنت لە نەهێشتنی
نەخوێندەواریدا بەڵگەی نیشتمان
پەروەریتە .

# خەڵاتی نوبل !!!

جەمال ئامادەی کردووە

ئەلفرید برنهارد نوبل لە ساڵی ١٨٣٣ ز لە شاری ئستوکهلم پایتەختی سوید هاتووتە ژیانەوە .... باوکی لە شاری سان‌بطرسبرغ ـ لینین گراد ـ ئەندازیار بووە لە بواری پێش خستن چەك و پێویستی‌یەکانی جەنگ‌دا ... بۆیە نوبل رووی‌کردە ئەوێ‌و لەگەڵ باوکی‌دا کاری ئەکرد .

لەو ماوەیەدا دووچاری هەندی کارەساتی ناخۆش ئەهات لەو کارەساتە ناخۆشانە ... مردنی برایەکی بە تەقینەوەی هەندی کەرەسەی کیماوی بوا .

...دوای ماوە یەك نوبل گەڕایەوە بۆ ئستوکهلم وە بەردەوام بوو لە تاقی‌کردنەوە کیماوی‌یەکان لە بواری دروست‌کردنی چەك‌و تەقەمەنی‌دا ... دەزگا پیشەسازی‌یەکانی هەتا ئەهات فراوان‌تر ئەبوو . وە لە هەندێك وولات‌دا لقی ئەو دەزگایانەی کردەوە .. ئەوە بوو لە ئەلمانیاو لە ساڵی ١٨٦٦ گەیشتە ئەوەی بتوانێت « دینامیت » دروست بکات .

لە ئەنجامی بەدەست هێنانی ئەو قازانجە زۆرەی بەدەستی ئەکەوت ... تا ئەهات دەزگاو کومپانی‌یە پیشەسازی‌یەکانی فراوانتر ئەبوو ... ناوبراو باسی بە نرخی هەیە لە بارەی نەوت‌و ئاوریشمی دەست‌کرد و لاستیك .

نوبل زۆر پەشیمان بووەوە لە داهێنانی داینامیت .. بەڵام پاش ئەوەی هەموو شتێك لە دەستچوو ... وە کەوتە بەردەستی کەسانی‌وا کە بەو هۆیەوە ئەتوانن وێران‌کاری‌و لەناوبردنی شارستانی‌یەتی‌و مرۆڤایەتی بکەنە دیاری دەستیان بۆ بیرکردنی ئامانجە رەشەکانیان ...

... نوبڵ لە ساڵی ١٨٩٦ ز کوتایی ژیانی هات وە لە داخوازی‌یەکانی کە پاش خۆی بەجێ بهێنرێت ...داوای کرد سەند وقێك دابنرێت لە دەست‌کەوتی دەزگاو کومپانی‌یە پیشەسازی‌یەکانی ... کە هەموو ساڵێك خەڵاتی بەنرخ پێشکەش بکەن بەو بلیمەتانەی کارئەکەنە سەرپێش‌کەوتنی مرۆڤایەتی لە بوارەکانی ئەدەب ... پزیشکی ... فیزیام کیمیاء ... وە ئاشتی‌دا .

هەروەها لە ساڵی ١٩٦٩ پاسێکی تریش خرایە پاڵ ئەو پاسانەی کە خەڵاتی نوبل ئەیان گرێتەوە ، وە ئەو پاسەش بواری ئابوری‌یە .

لە ساڵی ١٩٠١ وە بۆ یەکەم جار دەست‌کرا بە پێش‌کەش‌کردنی خەڵاتەکانی نوبل ... سەرمایەی سندووقەکە لەو کاتەدا ٨٫٣١١ ملیون دولار بوو .

وە بۆ هەڵبژاردنی ئەو کەسانەی شایانی ئەوەن خەڵاتی نوبل وەربگرن ... لیژنەو دەزگای شارەزای تایبەتی هەیە لە ( سوید ) کە ئەم ئەرکەیان گرتۆتە ئەستۆ .

بەڵام خەڵاتی ئاشتی لیژنەیەکی تایبەتی هەیە لە ئوسلو پایتەختی « نرویج » ئەرکی هەڵبژاردنی خاوەن توانا لێهاتووەکانی گرتۆتە ئەستۆ وە لەژێر سەرپەشتی پەرلەمانی نەرویجی‌دا .

ئەوەی شایانی باسە بۆ لیژنەکان هەیە خەڵاتەکان دابەش بکەن بەسەر دوو وە یان سێ لەو بلیمەتانەی شایانی وەرگرتنی ئەو خەڵاتەن .

... خەڵاتەکانی نۆبل لە سالانی جەنگی یەکەم‌و دووەم‌دا بەکەس نەدراوە ...

... بەڵام لەم ساڵانەی دوایی‌دا لە چۆنیەتی دەست نیشان‌کردنی ئەو کەسانەی شایانی ئەو خەڵاتەن

هەر چۆنێك بێت هەڵسەنگاندنی مرۆڤانی خزمەت گوزار بە مرۆڤ‌و مرۆڤایەتی کارێکی ئەوندە ئاسان نی‌یە کەلە لایەن لیژنەیەك وەیان چەند کەسانێکەوە بکرێت .

... لە ڕاستی‌دا سەرئەنجامی کارکردنو کردەوە لێهاتووەکانیان لە ژیان‌دا وە بۆ سەر ژیان وە بۆ مرۆڤ‌و بەمرۆڤایەتی ئەی سەلێنیت کە پایەی ئەو کەسانە لە چ پلەیەک دایە .

# ئافرەت لە چیرۆکی کوردی داو کارێکی ناتەواو

**محمد رشيد فتاح**

لەم چەندانەدا کاك صـــەباح غالب دەســت پێشکەری‌ی کـــردو ، دوای خۆ هیـــلاك کردن‌و ماندووبوونێکی زۆر توانی لێکۆلینەوەیەکی ( ٣١٨ ) لاپەڕیمان لە ژێر ســـەر ناوی ( ئافرەت لە چیرۆکی کوردی‌دا ) بخاتە بەردەست .

ئەمەش بەلای‌منەوە جێگـــەی شانازی‌و ڕێزو سوپاسە بۆ نووسەرێکی لاوی‌ی وەك صەباح ، چونکە تاکو ئیمرۆ کتێبخانەی کوردی لەم جۆرە لێکۆلینەوەو لۆژینەوانە بێ‌بەش بووە ، بەتایبەتی لە لایەنێکی وا ناسك لە چیروکی کوردی‌دا ، کە ئەویش لایەنـــی ئافرەتـــە .

کاك صەباح لە سەرەتاوە پێش ئێمە دەکەوێ‌و ، ئەوەتا بە دڵ‌و دەروونێکی سافو بێگەردەوە پێمـــان دەڵێ : ـ « منیش بەم حالەمەوە لەمە چاکترم لـــە دەست نایەو ، منەتیش بە سەر کەسدا ناکەم . بـــە هەموو دلێکەوە ئامادەی وەرگرتنی ڕەخنەی برایانەو ، ئامۆژگاری دۆستانەم . » ( ل ـ ٨ ـ ئافرەت لە . . )

منیش بەلای خۆمـــەوە ، لەم بۆچوونەی کاك صەباحەوە بە پێویستم زانی باری سەرنجی خـــۆم بهاوێژمە سەر هێندێ لەو هەلەو ، کەم‌و کورتیانەی کەوا نووسەر تێ‌ی کەوتووە .. هیواداریشم کـــە جێگەی خۆیان بگرن .

بەر لە سەرنجەکانم دەمەوێ ئەوە بخەمە پێش چـــاو .

١ ـ ســـەرباری بەربلاوی‌و گەشەکردنی باری رۆشنبیری‌و ئەدەبیمان ، هەروەها بلاوبوونەوەی بیری پێشکەوتوانەو ، تیوری‌ی زانســـتیانە لە ناوماندا . دەبینین تاکو ئیمرۆ هێنـــدێ لە رەخنـــەگران‌و ، لێکۆلەرەوەکانمان ، لە نووســـین‌و ، باسەکانیانـــدا ( مەنهەجێکی فیکری ) دیاری کراویان نیـــە . تا لەبەر رۆشنایيا هەنگاو هەلگرن‌و ، شوێن پێ‌ی خۆیان قایم کەن . کە ئەمە دەلێم ، مەبەستم لە هەمـــوو رەخنەگرێك‌و لێکۆلەرەوەیەکی خۆمان نیە ، بەلکـــو ئالێو تەرا دەبینم . کە هێشتا ڕێگـــەی خـــۆی نەدۆزیوەتەوەو ، ویان ناشبەوێ بیدۆزێتەوە ! .

کاك صەباح یەکێکە لەوانەی کە تائێستە لـــە نووســـیندا خـــاوەنی ڕێبـــازێکی فیکری‌ی دیارو ئاشکرانیـــە . تا خوێنەر لە چاوی ئەو ڕێبـــازە فیکری‌یەوەی بڕوانێتە بەرهەمەکانی‌و ، حسابیشیان بۆ بکا ! .

هەر نەبوونی ئەم ڕێبازە فیکری‌یەش بۆتـــە هۆی ئەوەی کەوا بکەوێتە چەندان هەلەی زەق‌و : کەم‌و کورتی روون‌و ئاشکراوە .

دەبینین دەمێك ( ئایدیایانە ) دەڕوانێتە بەرهەمە ئەدەبی‌یەکان‌و ، لە واقعی کۆمەلایەتیمان دایان دەبڕێ‌و ، دەمێکیش پەنا دەباتە بەر بیرو باوەڕی ( ماتەری ) و ، چەشنی ماتەری‌یەك سەرنجیان تێدەگرێ . سەرەنجامی ئەمەش بێگومان شتێکی سەیرو سەمەرە دەردەچێ !! .

ئایدیایی‌و ماتەری‌ی لـــە تیورو پراکتیکـــدا دژبەیەکن‌و ، پێکـــەوە ناسولحێن . ( هێندێ لـــە فەیلەسووفە ئایدیایی‌یەکان هەولی شێواندنی تیوری ( ماتەری ) یان داوە . بەوەی گوایـــە . ( ماتەری ) ئاوێتەیەکە پێش ناکۆکی ماتەری‌و ئایدیایی دەکەوێ . لە راستیدا ئەم ئاوێتە کردنەش تەنها پەردەیەکە بۆ شاردنەوەی ( ئایدیایی ) ( پۆلیترز ـ ل ـ ٢٠٨ ) .

نووسەرو فەیلەسووفی ئایدیایی هەبوون‌و هەن . هەروەها نووسەری ماتەریش هەن ، هەریەکەشیان بە قەناعەتەوە بێ ئەوەی باز بازێن بکەن ، قەلەمەکانیان لە گوڕو گەڕدایە .

بریا کاك صباح لەم کارە ناسکەیدا یەك لایەنی هەنگاوی بنایەو ، نەیکردایە بە دوو . چونکـــــە بەراستـــی‌ی مەســـەلەی ئافرەت لە کۆمەلگایـــەکی دواکەوتووی وەکو ئیمرۆی ئێمەدا ، تەنها بە تیوری زانستی‌ی نوێ‌وە دەبێ چارەسەرو ڕێ‌و شوێنی بۆ

...ری کرێ . لەبـــەر ئەوەی بیرو باوەڕی ئایدیایی ...امەکانی ئافرەت لە کۆمەڵگایەکی فرەچینی وەکـــو ...تیمەدا سارێژ ناکاو ، دەرمانی‌ی بۆ نادۆزێتەوە .

بۆ راســـتی‌ی قسەشمان خوێنــــەر دەتوانێ ...گەڕێتەوە بۆ ئەو سەرچاوە دژ بە یەکانەی کەوا پەنای ...ۆ بردوون .

٢ ــ لە لایەکی تر تاکو ئێستە لای ئێمە هێندێ ...رای رەخنــــەگرو لێکۆڵەرەوە لــــە ئەنجامی باری ...سایکۆلۆژی خۆیانەوە .. کە ئەمەش بێگومان لە رەنگ ...دانەوەی باری ناهەموارو دواکەوتەیی کۆمەلایەتیمان ...بەدەرنیە ، دەبینین ( انحیاز ) و ، دەستیاو ، جۆری ...پەیوەندی‌ی دۆستانەو برایانە ، بەســـەر بەرهـــەمو ...نووسینەکانیدا زاڵە .

بێگومان ئەمەش لە تەك ئەو خاڵەی سەرەوەدا نەخۆشیەکی ترە ، لەو نەخۆشیانەی کەوا گیرۆدەی رەخنەو لێکۆڵینەوەی ئەدەبی کوردی بۆتەوە .

کاك سەباحیش هەرواتە . خوێندەواری زیرەك دوای خوێندنەوەی بەرهەمەکەی : هەســت بـــەوە دەکات .. کە ناوەڕۆکی ئەو لێکۆڵینـــەوەیە نـــەم کەم‌کورتی‌یەی پێوە دیارە .

بۆ نمونە هێندێ چیرۆك نووس لە ناو هێنــان فەرامۆش کراون . گەرچی لە ژیانی ئەدەبیشیاندا یەك دوو چیرۆکیان هـــەبێ ، کە راســـتەو خـــۆ پاڵەوانەکانیان ئافرەت بێ ، یا دەوری ناسەرەکیـــان هەبێ ، کەچی نەك لێکۆڵینەوەیان لەسەر نەکرابێ ، بەڵکو لە ڕیزی ئەوچیرۆکانەشدا کەوا صەباح ناوی بردوونو ، دەشڵێ باسم نەکردوون ، ناویان نەهاتووە.

کەچی دەبینی‌ی هێندێ چیرۆکی تر کەوا ئافرەت تیاندا دەوری ناوەندی‌و ، کۆمبارس دەبینێ ، نووسەر نەك لای لێکردۆتـــەوە ، بەڵکو زیاد لە پێویســـــت بایەخیشی پێ‌داوە .

خۆ جاری‌وا هەیە .. کەسانێك کەوا رەخنەیان لە سەر کۆمەڵە چیرۆکێك کاتی خۆی لە گۆڤارێکــدا بلاوکرۆتەوە ، نووسەر جگە لە بەســـەرکردنەوەی ، بەڵکو ناوو ناونیشانو تەمەنو شوێن پێ‌ی ئـــــەو رەخنەگرەشی تۆمار کردووە . کە ئەمەش جێگەی لە نێو باسەکەی نووسەردا نابێتەوە .

خوێندەوار دەتوانێ چاوێك بەو بیبلۆگرافیایەی کاك ( عمر مارف بەرزنجی ) دا بگێڕێتەوە ، ئەو دەمە بۆی دەردەکەوێ کەوا کاك صەباح چەنـــد چیرۆکی پشت‌گوێ خستووە .

کاك صەباح لە ســـەرەتایی لێکۆڵینەکـــەیەوە : نازانم بە دەستی‌ی ئەنقەستە ، یا لە ( غەفلەتەوەیە ) کەوتۆتە هەڵەیەکی گەورەوە .. فەرموون بزانن دەڵێ چی : « تائێســــــتە چیرۆکی هونـــەری‌ی کـــوردی لێکۆڵینەوەو ، نرخاندنێکی زانســــتیانەی شــایانو گەورەی لەسەر نەکراوە . ئەمە جگە لەو دوو کارەی لە لایەن کاك جەمشید حەیـــدەری قوتابی دکتۆرای ئەکادیمی زانستەکانی سۆڤیەت لە لنینگراد .. و خاتو بەدیعەی مەحوی .. قوتابی‌ی دکتۆرا لە زانستگای ئازاد لە بەرلینی ئەڵەمانیای رۆژئاوا پێ‌یەوە خەریکن بۆ نامەی دکتۆرا » ( ل ــ ٧ ــ ئافرەت له .. )

جارێ بەر لە هەمووشتێ ئەو دووکارەی ئـــەو دوو لاوە کوردە پێوەی خەریکن ، مایەی شانازی‌و ، رێز لێنانی هەموو رۆشنبیرو نووســـەرێکی کوردە . بریا دەیانی وەك ئەوانمان هەبوایەو ، بەو جۆرە کارە پیرۆزانەوە ماندوو ببوونایە ! .

بەڵام بابپرسین .. ئەی کارەکەی ( حســـــین عارف ) ؟ .. کـــە لـــە ســـاڵی ١٩٧٧ دا کەوتـــە بەردەستتمان . ( چیرۆکی هونەری‌ی کوردی ) کارێکە شایانی ناوبردن نیە ؟؟ . ئەی کارەکەی ( عومەر مارف بەرزنجی ؟ ) لەوانەیە نووسەر بڵێ .. ئەوکاتەی ئەم قسانەم کردووە ، کارەکەی ( عومەر ) لە بەردەستتا نەبوو . باشە کاك صەباح ، ئەو دوو کارەی . ئـــەو دوولاوە کوردە پێوەی خەریکن تەواوبوون ؟ . لەبەر دەستتان ؟ . تا بزانین چۆنن ؟ . ئەبێ صەباح خۆی دیبنی‌و ، هەڵی‌سەنگاندبێ ؟ . ئەگینا هەرگیز قســـەی وای نەدەخستە تای تەرازووەوە .

کاك صباح بەمەشەوە ناوەستێ ، زیاتر پـــێ دادەگرێ‌و ، لە هەمان لاپەڕەدا دەڵێ : ــ « هەموو ئەو هەوڵو پێناسینەی بۆ بەرهەمی چیرۆکمان دراوە ، لە وتارو لێکۆڵینەوەی سەرپێ‌ی بەولاوە شتێکی دیکە نی‌یە ! . » .

لێرەدا تەنها ئەوە دەڵێم .. رەخنــــەگرانو ، لێکۆڵەرەوانی‌ی چیرۆکی کوردی ، مادام ئێوە خاوەن شەهادەو ، قوتابی دکتۆرانین .. تا ئێستە هەرچێتیان کردووە فت !!.

صەباح لە لایەکەوە چیرۆکەکەی جەمیل سائب ــ لە خەوما ــ بە چیرۆکێکی ریالیستی رەخنــەگرانە ناودەبا . لە لایەکی ترەوە . ئەم چیرۆکە هەر بەلای

ئەوەوە دەبێتە چیرۆکێکی ( لامعقول ) و دوور لە واقع . گەرنووسەر لە چۆنێتیی سەر هەڵدان و سیفەتایبەتی یەکانی ئەم ڕێبازە ئەدەبیە شارەزاییەکی هەبوایە .. ئەوەی دەزانی .. کە ئامانجی ئەم ڕێبازە ئەدەبیە ، رەخنەگرتنێکی سلبی یە لە واقعی کۆمەڵایەتی . )

چونکە جەمیل سائب بە ئاشکرا پەردەی لە رووی کەم و کورتی و ، چەوساندنەوەو ، زوڵم و زۆری رژێمی دەستەڵاتداری ئەوسەردەمە هەڵداوەتەوە . لە مەدا نووسەر دوای سۆزو عاتیفەیەکی رووت و قووت کەوتوەو ، بەلای شیکردنەوەو ، تێڕوانینێکی زانستیانە گوزەر ناکا .

لەبەر ئەوەش کەوا جەمیل سائب هەڵسو کەوتی ئافرەتانی چینی دەستەڵاتداری ئەوسەردەمەی بە سلبی باس‌کردووە . ئیتر ئەوچیرۆکە لامەعقول و شێواندنی واقعە !! .

صەباح دەڵێ : ــ « هەموو یەکێکی بەویژدان حەقیقەتی ئەو مەسەلەیە دەزانێ کە ئەگەر ژنی چینی دەرەبەگ لە ناو هەموو میللەتێک و ، لە گشت شوێن و کاتێکدا دەوری چەوسێنەری بێنێ و هاوبەشی مێردو پیاوی چینەکەیان لەو رووەوە کردبێ ، ئەوا ژنی چینی دەرەبەگی کورد بە گشتی و حەفیدزادەکان بە تایبەتی ئەو کارەیان تا ڕادەیەك بە ناڕەوا زانیوە ( ل ــ ٣٣ ــ ئافرەت لە . . . )

بۆ ڕاستکردنەوەی ئەم هەڵە زەقە .. پشت بەو سەرچاوەیە دەبەستین ، کە کاك صەباح خۆی لە لاپەڕە ( ٧٤ ) دا پشتی پێ بەستووە .

( لە هەموو کۆمەڵگایەکدا رەوشت و خوویەکی دیار هەیە . ئەویش بەندە بە یاساو بیروباوەری چینی دەستەڵاتدارەوە .

لە یاسای کۆیلەیەتیدا رەوشتی خاوەن کۆیلەکان .

لە کۆمەڵگای دەرەبەگیدا رەوشتی دەرەبەگەکان .

لە سەردەمی بۆرجوازیشیدا رەوشتی سەرمایەدارەکان .

( اڤاناسیف ــ گۆڕینی عزیز سباهی .

ئەمە بە کورتی کاکڵەی ئەو سەرچاوەیەی کاك صباح بوو کەواتە بەم پێیە ژنی دەرەبەگی کورد بەلای کاك صەباحەوە لە پیاوەکانیان جیاکرانەوەو ، بوون بە بوونی رەوشت و خوویەکی دوور لە چینەکەیان .. بێگومان ئەمەش تێڕوانینێکی ( ئایدیایانەیە ) بەرامبەر بە مەسەلەی ئافرەت .

بەڵی هەر ئافرەتی دەردبەگ بووە .. پاچەکۆڵەو ، رەزبڕین و ، مشت و جۆماڵ ، درووێنەو ، کرێکاری و ؛ هتد کردووە .. هەرگیز بە قسەی کاك صباح حازر خۆری بەر سێبەر نەبوون و ، نەرووتاندوتەوەو . نەچەوساندۆتە !! .

لە لاپەڕە (٣٠،٢٣)دا کاك صباح لە چیرۆکێکی باس نەکراوی کاك شێرکۆ ناکامدا ( نازانم ) دەڵی : ــ چیرۆکێکی کلاسیکیانەیە . کوڕێك هێندە ترسنۆکە ناتوانێ هەستیی خۆشەویستی لە ئافرەتەکەی بگەیەنێ .

ئەمە یە جگار جێی بەزەیی پیادا هاتنەوەیە . ئەوەی تۆزقاڵێك ئاگای لە سەرەتو بنەمای چیرۆکی کوردی هەبێ ، ئەوە دەزانێ . کە چیرۆکی کوردی لە قوتابخانەی کلاسیکیدا نەیخوێندووە . یەکەم هونەریی کوردی ڕێبازی ریالیستی رەخنەگرانەی گرتۆتە خۆی . شێرکۆی لاو لە کوێوە بەم قوتابخانەیەدا چوو ؟ .

بریا کاك صباح لە لێکۆڵینەوەکەیدا پەنای نەبردایەتە بەر باری سەرنجی ئەو گەریدانەی کەوا بە کوردستاندا گەڕاون و تێپەڕ بوون . چونکە لە سیاحەت نامەی ئەو جۆرە کەسانەدا بە تایبەتی کەوا هێندێکیان پیاوی داگیرکەریش بوون . وەك ( سۆن و .. ریچ ) .. تەنها باسی روالەت و ، دیوی دەرەوەی ئافرەتی کوردیان کردووەو ، بەلای هۆی بەرهەمهێنان و ، پەیوەندی بەرهەمهێناندا نەچوون ئیتر چۆن لە مەسەلەیەکی گرنگی وادا کە مەسەلەی ئافرەتە ، راو بۆچوونەکانیان پشتیی پێدەبەسترێ . دەبوایە لە بری سەرنج بۆچوونی ئەو گەریدانە . صەباح پشتی بە زانستیی نوێ ببەستایەو ، لە کۆمۆنزمی سەرەتاییەوە تا ئێستە دەوری ئافرەتی دیاری بکردایە .

ئیتر بە هیوای ئەوەی کەوا نووسەران و رەخنەگرانمان هەریەکەیان بەلای خۆیەوە .. چەندان مەڵۆیتر لە شارای هەڵەو کەم و کورتی و ناتەواویەکانی ( صەباح ) ڕاست بکاتەوە .



روسو

# ژان ژاك رۆسۆو
# پەیمانی كۆمەڵایەتی

كەمال غەمبار وەری گێڕاوە

**تا ئەمرۆ دوو سەدە بەسەر مەرگی ژان ژاك ڕۆسۆدا تێدەپەڕێ . فەیلەسووفی گەورە لە ساڵی ١٧٧٨ دا مردووە ، كە ڕێك كەوتـــی بـیرەوەری شەستو شەشەمینی لەدایك بوونیو ، بەر چەنـــد ساڵێك لە بەرپابوونی شۆڕشی فەرەنسا دەكا ، كـە خۆی هەوێنی شۆڕشەكە بووە .**

ڕۆسۆ لە ماوەی ژیانیدا[1] كارێكی گەورەی كردە سەر بیری ئەوروپا . تەنانەت لەناو ئەو لوتكانەی كە سەدەی هەژدەم بە مرۆڤایەتی بەخشین وەك ڤۆلتێرو مۆنتسكێو دالمبیر ، هاوتای كەم بووە ، یەكێك بووە لە ناودارترین ئەو سێ ڕۆناكبیرەی كە ناویان بـــە تیئۆری پەیمانی كۆمەڵایەتی یەوە بەستراوەتەوە ، كە ( تۆماس هۆبز ) و ( جۆن لۆك ) ن لـــە ئینگلتەرەو فەیلەسووفی ڕۆناكبیر لە فەرەنسا ژان ژاك ڕۆسۆیە.

ئەو فەیلەسووفانە لـــە ڕێگەی كارامەیـــیو توانایانەوە تیئۆری پەیمانی كۆمەڵایەتییـــان پێداو سەركەوتنێكی باشی بەدی هێنا بەوەی كە كارێكی گەورەی كردە سەر ئینگلتەرەو فەرەنساو وڵاتـــە یەكگرتووەكانی ئەمەریكا ، بگرە دەورێكی ڕاستەوخۆی نواند لە پێـــخستنی ڕژێمە دیموكراسییەكانی ئـــەو وڵاتانە ، بەڵام دیسانەوە كە شۆڕشێكی بەرپاكرد كە زۆر شتی لە ڕووداوەكانی گۆڕی . ئەویش پاش ئەوەی بە فەلسەفەكانیان حوكمڕانیان لە ئاسمانەوە بۆ سەر زەوی داگرتو . ئەجێی پەیوەنـــدی سروشـــتی پەیوەندی شارستانییەتیان دانابەوەدەرفەتێكی نایابیان بۆ مرۆڤ ڕەخساند كە لە كردەی پێشكەوتنی كۆمەڵا دەوری خۆی ببینێ . بەوەی كە تاكەكـــەس ئـــەو یەكێتییەیە كە پەیمانەكەی لەســـەر بنیات دەنرێ .

ڕۆسۆ خۆی دیارترین بانگ ڕاهێڵـــەری ئەم تیئۆرە بووەوە بەناوبانگترین كارتێكەر بووە كە بە شێوەیەكی تایبەتی دەورێكی هێجگار گەورەی لە مێژووی بیری رامیاری بینی ، ئەویش لە ڕێگەی ئەو نووسینانەی كە پشتگیرییان لێ ئەكراو لە هەمان كاتیشا كەوتنە بەر شەپۆلی ڕەخنەو تیرو توانج تێگرتن . لە ڕاستیدا لە نێوان پشتگیری لێ كردن لەلایێو ڕەخنە لێ گرتنی توندو تیژ لە لایەكی ترەوە مەزنی ڕۆسۆ دەردەكەوێ ، وەك بیر ڕۆناكێك كـــە بیروباوەڕەكانـــی شەقلـــی نوێكردنەوەی ڕەسەنیان پێوە دیارە .

**بەشێوەیەكی گشتی ئەگـــەر بمانـــەوێ لـــە فەلسەفەی ڕۆسۆ بگەین ، دەبێ لە پێشەوە بارو زروفی نەشونماكردنو سازبوونی بخەینە بـــەر ڕووناكیو كارتێكردنیان دەستنیشانیان بكەین كەدەوری**

**خۆیان له دیارکردنی بیروڕایەکانی ببنیوه .**

دووەمین هەنگاو دەبێ هەوڵی ئەوە بدەین کە لە بنچینەی فەلسەفە ڕامیاری‌یەکەو کۆمەڵایەتی‌یەکەی‌و ڕەنگدانەوەیان. لە هەڵوێست‌و ئەو بۆچوونانەی کە لە تیئورەکەی ناو پەیمانەکەدا هەنە بە تەواوەتی شارەزا بین . سێ‌یەمین شت ئەوەیە کە دەبێ هەندێ دیاردەی ڕێك‌کەوتن یا ئەو جیاوازی‌یەی کە لە نێوان خۆی‌و ( هۆبز ) و ( لۆك ) دا هەیە ڕەچاو بکەین . تا لە هەنگاوی چوارەمینمانا بتوانین بە ووردی لە تێروانینی ئاستی ڕەسەنی بیرو باوەڕی ڕۆسۆ بکەین . تا لە کۆتایی‌دا لە کارامەیی‌و شارەزایی ئەو فەیلەسووفە ڕۆناکبیرە بکەین ، کە پاش مردنی دوو سەدەی دەوام کرد .

ئاشکرایەو هەمووشمان لەسەر ئەم ڕایەین کە کرداری ڕۆناکبیران نەك ژیانی کەسایەتیان جێگەی سەرنج ڕاکێشان‌و مایەی زیندەیین لە دڵ‌و دەروونا ، ئەگەر چەند سەدەیێکیش بەسەر مەرگیانا ڕابوێرێت.

لە سەرەوەش ژان ژاك ڕۆسۆ بەڕای زوربەی خەڵك لەم بنکەیەدا بەدەرە ، چونکە هەموو لەسەر ئەو ڕایەن کە شەخصیەتەکەی بە وەرچەرخاندنەوەیەکی هێجگار گەورە دەژمێرێت کە عەقڵیەتی ڕۆژئاوا پێوەی لکاوە . ئەم ژیانە پڕ لە وروژانەی ئەم فەیلەسووفە ڕۆناکبیرەی تیادا ژیاوە . وای لێ کردووە بۆتە مرۆڤێکی گیان شلەژاوی هێجگار هەستیار ، ئەم دوو ڕەوشتەش بە ئاشکرایی لە نووسینەکانیدا دەردەکەون ، بەرادەیێ هەندێ جار لە کۆمەڵ داخ‌دارە وەك لە ( نامیلکەیێ لە پەیدا بوونی نایەکسانی نێوان خەڵك ) دا دەردەکەوێ ، جارو باریش بە تەواوەتی پایەی کۆمەڵ بەرز دەکاتەوە وەك لە کتێبی « پەیمانی کۆمەڵایەتی » دا بە تەواوەتی دەردەکەوێ .

**لە زۆر شوێن دەتوانین شەخصیەتی ڕۆسۆ بەدی بکەین بەڵام زیاتر لە (( بێ ئێنانەکان )) ی‌دا دەرکەوێ ، بەتایبەتی کە چوونیەتی هاتنی بۆ دونیاوە باس لێوە دەکاو دەڵێ :**

« من بەری گەرانەوەی دایك بووم بۆ لای باوکم ، پاش ئەوەی کە ماوەیەك لێکدابڕان ، پاش دە مانگ من لەدایك بووم . لاواز ... نەخۆش .. بووم ، دایکم ژیانی خۆی بە من بەخشی . بەڵام لەدایك بوونم یەکەم هەنگاوی بەدبەختی و کڵۆڵیم بوو » . ڕۆسۆ لە « پێ لێنانەکان » یدا دەڵێ « من مەبەستم ئەوەیە کە مرۆڤێك بخەمە بەردەم خەڵك کە بە ڕاستگۆیی هەموو سروشتەکەی‌دەژی ، ئەو مرۆڤەش منم ... من نەك یەکێکی تر غەیری خۆم .

بەڕاستی من زۆر کەس لەو خەڵکە دەناسم . بەڵام من وەك هیچیان دروست نەبووم بە ڕادەیێ خەریکە وابچێتە مێشکەوە کە مرۆڤێکی تر نی‌یە لە من بکا . ئەگەر لە هەموویان چاکتر نەبم . هەر نەبێ لەوان جیاترم » .

لەو چەند دێڕەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە ڕۆسۆ لە ناو ڕۆمانسیەتدا خنکاوە ، هەروەها یەکجار هەستدارد . لە ڕاستیشدا ژیانی تایبەتی خۆی ئاوێنەی بێ‌گەردی ئەو گیانە شلەژاوەیە کە پڕە لە لێڵی‌و ناکۆکی‌و شپرزەیی . خۆی ئەوە دەسەلمێنێ کە دەستی بۆ دزی کردن درێژ کردووە ، سەرەڕای ئەوەش تاوانەکەی داوەتە پاڵ کیژۆلەیێکی کلۆل ، برادەرێکی خۆی بەجێ هێشت چونکە هەستی بە گرانی ئەو ئەرکە کرد کە چاودێری دەکردو نەخۆشی یەکەی سارێژ دەکرد ، هەروەها ماوەیەك لە ژیانی لەسەر ڕەنجی شانی ئەو ئافرەتانە ژیا کە کەوتبوونە داوی خۆشەویستی‌یەکەی ، زیاتر لە وەزیفەیێکی بینی‌و تیایاندا سەرنەکەوت. تەنانەت کە ساڵی ١٧٥٤ دەستی لەگەڵ « تیریز لیڤاسیر » تێکەڵ کردو چەند منداڵێکی لێ بوو یەك لەدوای یەك دەیبردن بۆ هەتیوخانە بۆ ئەم کارەشی جۆرەها هۆو بیانووی دەهێنایەوە .

**لە لایەکی تریشەوە ئەم وێنەیە وەك تەواوی ڕۆمانسییەت ڕوویێکی تری بە خۆیەوە بینی . هە کە ڕۆسۆ دەستی دایە قەڵەم نووسینەکانی سەرنجی خەڵکیان ڕاکێشاو خاوەن قەڵەمیان گەیاندە لوتکە. هەر چەند باوەڕێکی پتەوی بە پاکی‌و چاکی سروشتی مرۆڤایەتی هەبوو ، هەروەها بڕوای بە خراپەکاری کۆمەڵگای مرۆڤایەتی هەبوو ،**

خۆیە بە پێویستی زانی کە ڕەخنەیەکی توندو تیژ لە ڕژێمی ڕامیاریو کۆمەڵایەتی بگرێ ، چونکە ئەو ڕژێمانە بوون کە مرۆڤایەتییان ڕامالیو نەیانهێشت خەڵك بە ئارەزووی سروشت بژین . بۆیە ئەمە شتێکی سەیر نەبوو کە نووسەری « ئەمیل » و « هیلۆیزی نوێ » کتێبە بەنرخەکەی « پەیمانی کۆمەڵایەتی » پێشکەش بکات کە بەرگرییەکی پیاوانە لە مافەکانی مرۆڤو تێکۆشانی بەردەوامی دژی دیکتاتۆریەت نەك لە فەرەنسا بەڵکو لە هەموو شوێنێکی جیهاندا دەکرد بەهۆی بیروڕایەکانی ، پیسترین تاوانی خرایە پاڵو حکومەتی فەرەنساو جنێف دەیانچەوساندەوە ، لە شارێکەوە بۆ شارێکی تر بە دواوەی بوون ، هەروەها کتێبەکانو نووسراوەکانی سووتێنران . ناچار بوو چووە ئینگلتەرەو بووە میوانی « دافید هیوم » ی و ( ۆستی ) ئەویشی واز لێ هێنا لەبەر ناکۆکی نێوانیان . ڕێگەی پێ نەدرا بگەڕێتەوە فەرەنسای وولاتی ، لە دوا ڕۆژەکانی ژیانی گەڕایەوە بە پیریو فورِبەسەری سەری نایەوە .

هەر کە هەواڵی مردنی بڵاو بۆوە زۆر قسەو چیرۆکو بەندو بالوورەی پڕ لە گومان بڵاو بۆوە ، گوایە بە دەمانچە خۆی کوشتووە . هەندێکیش وتیان بە دەستی دۆستێکی کوژراوە . هەرچەندە بەکالاکرد نەوەی لاشەکەی ئەوەی سەلماند کە ئەو پروپاگەندانە هیچیان ڕاست نین ، بەڵکو لە ئەنجامی زەهراوی بوونی خوێنی مردووە، شتێکی سەیر ڕووی دا ، ئەویش ئەوەبوو کە حکومەتی فەرەنسە ساڵی ١٨٩٤ بڕیارێکی دەرکرد کە ئێسکو پروسکی لە دوورگەی « حور » ەوە بگوێزرێتەوە بۆ « بانسیوون » کە لەوێ لە تەنیشت ڤۆلتێری دوژمنی خوێنینی بنێژرێت .

ئەگەر چاوێك بە چاپی یەکەمی کتێبی « پەیمانی کۆمەڵایەتی »دا بخشێنین ، کە لە پێشەوەی کتێبەکەدا نووسیویە : « مرۆڤ بە سەربەستی لەدایك بووە بەڵام لە هەموو شوێنێ دیلی کۆتو زنجیرە ... چۆن ئەمە بووە ؟ نازانم ! » دەبینین چ تۆڕانێك بەسەر ئەم وتەیەدا هاتووە . ئەویش ئەوەیە کە دوو ڕاستیمان دەخاتە بەردەم کە ئەمانەن :

**١ ـ مرۆڤ دەبێ ئازادو سەربەخۆ بێ .**

**٢ ـ بە دەگمەن هەڵدەکەوێ مرۆڤ لە ژیانی واقیعدا ئاوابێ .**

مەبەستی ڕۆسۆ ئەوەیە کە مرۆڤ لە قاوغی گیانی تاکەکەس دەرچێ تا ڕادەی ناکۆکی . هەروەها دەڵێ : بەهێز هەرگیز هێزەکەی ناگاتە ئەو ڕادەیەی لە هەردەم دەسەڵاتدار بێ ئەگەر ئەم هێزە نەبێتە ڕاسێو گوێ ڕایەڵی کردنی ئەرکێك بێ ، بەڵام لە لایەکی ترەوە مرۆڤ نابێتە دەسەڵاتێکی ڕاستەقینە بەسەر هی ترەوە ، مادامەکی هێزەکە نابێتە مافێك ، تەنیا پەیمانەکان دەمێننەوە بناغەیێك بۆ هەموو دەسەڵاتێکی ڕەوا لە نێوان خەڵکا . هەر لە سەرەتاوە خەڵك ڕوویان کردۆتە شێوەی گردبوونەوەیێ کە تاکەکەسو کەلو پەلی هەموو ئەندامێك بپارێزێو بە هێزی هاوبەشی بەرگری لێ بکا . هەر کەسێ لەگەڵ گشت یەکگرێو تەنیا گوێ ڕایەڵی خۆی بکات، هەروەك پێشوو سەربەست دەبێ ... بەم شێوە ڕۆسۆ بڕیاری ئەوە دەدا کە پەیمانەکە هەموو ئەوانەی وەدەس هێناوە . بەڵام ئەو هەر تەنیا بەمەوە ناوەستێ بەڵکو دووبارە بڕیار دەدا کە هەرکەسێ لەم کۆمەڵەیەدا واز لە شەخسییەتی خۆیو مافەکانی دەهێنیو بۆ هەمووان هەوڵ دەدا ، ئەمە ڕێگایێ بوو بۆ ڕەخساندنی ئەو دەستە مەعنەوییە ـ گشتییەی کە گەل ئەندامەکانی وا دەدەنی کە گرد بوونەتەوە ، بەڵام هاوولاتی بەشدارن لە دەستکەوتی گشتی ئەگەر لێکیش دووربن .

هەندێ ڕەوشتو ڕواڵەت لە بیرڕاکانی ڕۆسۆدا بەدی دەکرێن . لە پێشەوەی ئەو شتانەی کە بە زەقی دیارن ئەوەیە کە ڕۆسۆ بە ئاشکرایی ئەو سەربەستییە سروشتییە کە لە ڕێگەی کەسەکان خۆیانەوە سنووری بۆ دادەنرێ لە سەر بەستی شارستانەتی جیا دەکاتەوە کە خواستی گشتی دیاری دەکا . ئەو سەربەستییە سروشتییەی کە لە دەس مرۆڤ دەچێ تەنیا سەربەستییەکی سەختەیە ، بەڵکو ناوێکی ترە بۆ کۆیلەتی .

بەڵام خاسیەتی دووەم ئەوە دەردەخا کە مولکییەت لە ئەنجامی دەسەڵات و هێزەوە هاتووەو بەوەی کە ئەنجامی مافەو بەو بەستراوەتەوە .

حـسیبەی سییەم ئەوەیە کە حوکمڕان بنەڕەتی [illegible] سەرچووەیەتی . [illegible] یاسا بەڕاست دانانرێ [illegible] بە [illegible] گشتی [illegible] لەچوویێ . دەبێ [illegible] دەوە هەڵبژێڕێتر لە هەمان کاتا بۆ بەرزەوەندی [illegible] [illegible] لە ڕۆسـۆ دەڵێ کـە [illegible] پەسـەند بکاو بە چاکتریـن [illegible]

**[illegible]ڕەوشتی [illegible] لە کۆمەڵایەتی سیاسی ئەوەیە کە دەولەتی ڕۆسۆ بێگومان دەولەتی گەلە ، کـە دەسەڵات بەدەست گشتەوەیە . بەلای ئەوەوە سێ جۆرە میری هەیە ، یەکەمیان ئەوەیە کە گەل . یـا زوربەی پۆلەکانی گەل ئەرکی حوکم دەگرنە ئەستۆ ، واتە هاووڵاتییەکان پایەو وەزیفەی گشتی دەگرنـە دەست ، بەم جۆرە رژێمەش دەڵێـن « ڕژێمـی دیموکراتی » .**

دووەم ڕژێم حکومەتی [illegible] [illegible]وکراتی بە کـە کاروباری حوکم بەدەس ژمارەیەکی کەمەوە دەبێ کە لە ڕێگەی **هەڵبژاردن** یا جیاوازی کردن یا بەهۆی سامان یا دەسەڵات دێنە سەر کار . **سێیەمین ئەوەیە کە جڵەوی حوکم** گێڕان دەکەوێتە دەست تاکەکەسێ کە بە ئارەزووی خۆی کار دەکاتو هەموو کاروبارێك دەگرێتە دەست خۆی ئەم حکومەتەش ، حکومەتێکی پاشایی‌یە بەلای ڕۆسۆوە ، خراپترین شێوە ئـەو **شێوەیە کە کاربەدەستەکانی پشتاوپشت** دێنە سەر کارو لە ڕەوشتی حوکمی ڕەوا دەردەچێ .

**بەم شێوە ڕۆسۆ هەمور ئەو ڕژێمانەی کە لە** سەردەمی ئەودا حوکمیـان دەگێڕا بـە ڕژێمـی ساختەچی‌و [illegible] دادەنان‌و داوای ڕووخانـی دەکردن .

**دەتوانین** [illegible] بڵێین کە ڕۆسۆ لە ڕووی باوەڕی بە دیموکراتیەتەو، کـەوتبووە ژێر کارتێکردنـی ( ئەرستۆ ) کە بەتایبەتی **ئەرستۆ** [illegible]وور بوو لەسەر ئەوەی کە دەولە[illegible] بچووك لە هی گەورە تواناترە کە پێداویستەکانی [illegible]مەکانی جێبەجێ بکـات .

[illegible]ڕۆسۆ » [illegible] [illegible]ڕووی بیروباوەڕییەوە کەوتبووە [illegible] کارتێکردنی [illegible]ی جنێف کە لەوێ لەدایـك

[illegible] لە « عالم الفكر » ی ژمارە سێی ساڵی [illegible] وە وەرگیراوە .

# کۆیـە و کاروانـی ئاواز و گۆرانی کـوردی

**کەریم شارەزا**

## ئاوازو گۆرانی‌ی کوردی : ـ

گەلی کورد لە سەردەمی بوویەوە تاکـو ئەمڕۆ . خاوەنی هونەری ئاوازو گۆرانی‌ی تایبەتی خۆی بووەو . ئەو هونەرەیشی بـە پێی قۆناغ‌و سەردەمی ژیانی . وەك ڕاستی‌یەك . هەردەم لە بزنەو بواری سەرخانی ژیانی ئابووریی کۆمەڵگاکـەی‌و دەستەو چینە کاربەدەستەکانی ئەو سەردەمەیـدا سووڕاوەتەوە .

هەرچەندە دیوی دووەمی ئەو هونەرەیشی بـۆ سوودو ماندوو حەسانەوە،یا بۆ ئاخ هەڵڕشتنی چینە زەحمەتکێشەکانیشەوە خولقابێ بەلام ئەو ڕێگـاو بوارە ئاشکراو فراوانەی پێ نەدراوە ، تا وەك دیوی یەکەمی گەشە بکاو بکەوێتە ناو هەمـوو کـۆڕو کۆمەڵێکی خەڵکی ئەو سەردەمـە ، بەتایبەتـی ئەنجومەنی کاربەدەستان ، تا بایەخی شایستەی خۆی پێ بدرێ .

**هونەری ئاوازو گۆرانی‌ی کوردی بـە هەردوو دیوەکەیەوە، لە هەمان سەرچاوەوە سەریان هەڵداوە**



**کۆیە شاری ئەدەب‌و هونەری کوردی**

**ئەویش ژیان‌و دەورو بەرەکەیەتی ، چونکە جگە لە بارە ئابووری‌یەکەی ژیانی بینسانی کوردە سروشتی دەورو بەرەکەیشی بەشێکی جودانەبڕاوە بووە لە ژیانەکەی‌ دەورێکی کاریگەری بووە لە خوڵقاندنی ئەو هونەرەجوانەدا .**

بۆیە دەتوانم بڵێم : لە کۆنەوە ئاوازو گۆرانی کوردی هەر ڕەنگدانەوەی ژیانی کۆمەلەکەی‌و دەنگدانەوەی ئاوازە سروشتی‌یەکانی نێو جەرگەی خاکە دلگیرەکەی بووە ! هەر لە هاژەی بەفراوانی کوێستان‌و خوڕەی تاڤگەی قەدپاڵی کێوە سەختەکان‌و شلپەی شەپۆلی ڕووباری ساردو سازگارو شنەی شەماڵی فێنکەوە بگرە ، تا دەگاتە قاسپەی کەوی سەر ڕەوەزە چیا بەرزەکان‌و چریکەی شالوورو بولبولی نێو باخ‌و ڕەزان ، تاتێکەڵ دەبن بە ترپەی پێی کچی نەشمیلان‌و ئاوازەی لەنجەی یاری شۆخ‌و شەنگ‌و خورپەی دلی ئاشقان‌و نالەی هەژاران .

ئەمانە هەموویان بوون بە هەوێنی ئاوازی گۆرانی کوردی‌و هەستێکی ناسك‌و جۆشێکی گەرم‌و گوڕیان خستۆتە ناو دڵ‌و دەروونی سەرجەمی ڕۆڵەکانی کورد بەگشتی‌و ، دەستەی خۆشخوان‌و گۆرانی بێژانی بە تایبەتی .

خۆشخوان‌و گۆرانی بێژیش لە ڕێگەی هەست ناسکی‌و بەهرەی هونەری‌یانەوە ، توانیویانە ئاوازی خۆش‌و دلکێش دابهێنن‌و بە دەنگی زولالیان مێشکی گوێگران مەست بکەن‌و گۆرانی‌و مەقامی ڕەسەنی کوردی بخولقێنن‌و پشتاو پشت بۆمان بەجێ بهێلن‌و بە پێی دەورو قۆناغ زاخاوی بدەنەوەو لەگەل چێژو ئارەزووی خەلکەکەیدا بگونجێنن‌و ، گەشەی پێبکەن‌و ، خۆشیان لە ڕێگەی بەهرەی هونەری ـ یانەوە جێ پێی خۆیان لە سەر زەمینەی پتەوی کۆمەلەکەیان بچەسپێنن‌و ، بوونی خۆیان بە چین‌و توێژەکانی گەلەکەیان بسەلمێنن .

هەرچەندە جاران خۆشخوان‌و گۆرانی بێژ وەك هونەرمەندێکی ئێستا چاویان لێ نەکراوەو ، ڕێزیان لێ نەگیراوە ، بەلام هەردەم لە قۆناغ‌و مەجلیسی میرو ئاغاو کاربەدەستاندا ، لە کوێخاو گزیرو سەرکارو پاکار بەردەست ماقوولتر بوون (١) .

چونکە هیچ دابو دەستوورێکی خۆشی‌و شادی خەلکەکە بە بێ ئاوازو گۆرانی‌و گۆرانی بێژان مەیسەر نەبووە ، هیچ شایی‌و گۆوەندی بووك گواستنەوەو ئاهەنگی شەوارەو سونەتانە ، بە بێ سازو ئاوازی دەهۆڵ‌و زوڕنا ، یا بلوێرو شمشاڵ‌و گۆرانی خۆشخوانان نەگێردراوەو ، هیچ هەلقەی زیکری صۆفیان‌و ، ئا هەنگی خوێندنەوەی مەولوودنامەی پێغەمبەر ، بە بێ ئاوازی دەف‌و دەنگی

# کۆیەو کاروانی ئاواز گۆرانی‌ی کوردی

کۆیە شارێکی مێژوویی کوردە ، لە کۆنـــەوە ناوچەیێکی بازرگانی‌و ڕۆشنبیریی زینــــدوو بووەو ، هەردەم کاروانسەراو قۆناغی سەرە ڕێی کاروانـــی بازرگانی نێوانی عێراق‌و ئێران‌بووە . بازاڕەکەیشی هەمیشە پێشانگای بەرهەمی کشتوکاڵی‌و پیشەسازی‌یە ناوخۆیی‌یــەکانی خۆی بووە ، پێویســتی‌یەکانی دانیشتوانی ناوخۆی‌و دەورو پشتی‌و دەرامەتـــی بازرگانەکانی ناوەوەو دەرەوەی دابین کردووە .

لە نزیکەو لە دوورەوە ، زاناو شاعیرو گۆرانی بێژە هەڵتەوتروەکانی کـــورد ڕوویان تێ‌کردووەو ، کردوویانە بە مەیدانی جموجووڵی‌و چالاکی‌یەکانـــی خۆیان‌و ، زانیاری هونەری شیعرو گۆرانییان تێــدا بلاوکردۆتەوەو لە هەمان کاتیشدا زانستو هونەری تازەیشی لێوە فێربوون(۳) . بەم جۆرە تا بووە بـــە شارێکی بازرگانی‌ی زیندووو ناوچەیێکی زانســـتو هونەری شیعرو ئاوازی مەقامی کوردی‌ی بە ناوبانگ، بە تایبەتی لە سەدەی نۆزدەهەمدا ، لەو کاتەی کـــە گەلێ زانای بلیمەتو شاعیرو هونەرمەندی هەڵکەوتوو، کاربەدەستی زانستو هونەر پەروەری وەکوو ( حاجی بەکر ئاغای قاصد ۱۷۸۵ ـ ۱۸۵۳ )ی زاینی و ( ئەمین ئاغای ئەختـــەر ۱۸۳۹ ـ ۱۸۸۷ ز ) ی شـــاعیری هونەرمەندی کوڕە گەورەی سەریان هەڵداوە ، کـــە بە درێژایی تەمەنیـــان کۆڕو دانیشـــتنەکانی نێـو دیوەخانەکەیان هەردەم گۆشـــەی ئەدەبو هونەری ڕەسەنی کوردی بوون ، هەر وەکوو مامۆستا مەسعوود محەمەد لە بەشی یەکەمی کتێبەکەی ( حاجی قادری کۆیی )دا دەڵێ :ـ

« ئەمین ئاغاش وەك باوکی ئەدیبو شـــاعیرو هونەر پەروەر بووە ، هەمان کۆبوونەوەی ڕۆشنبیریی سەردەمی باوکی لە دیوەخانەکەیدا بەردەوام بووە ، بە زیادکردنی کەرەستەیەکی تازەی زەوقو ئارایشت کە گۆرانی‌و مۆسیقا بووە . »(٤)

نووسەری ناوبراو لە سەر باسەکەی دەڕواو دوا بە دوای ئەمە دەڵێ :ـ « لە سەردەمی ئەمـــین ئاغادا بازاڕی گۆرانی‌و مۆسیقا سەر لەنوێ کەوتەوە گەڕ ، فێرگەی بەستە سازی‌و مۆسیقا شناسی کـــە



ڕوڵی مەقامبێژی هونەرمەند نەگیردراوە .

بە کورتی هونـــەری ئاوازو گۆرانی کوردی ، هەروەك لە دڵو دەروونی ڕۆڵەکانی گەلەکەی‌و لـــە سروشتی خاکەکەیەوە ڕسکاوە ، لە هەمان کاتیشدا بووە بە بەشێکی بنەڕەتی لە خوو ڕەوشتی ڕەســـەنی نەتەوایەتی گەلی کردو ، هەرگیز لێ‌ی جـــودا ناکرێتەوە .

بۆیە هەر لە کۆنەوە بەدەیان ، بەڵکوو بە سەدان ئاوازی گۆرانی ڕەسەنی کوردی لـــە ناو ڕۆڵەکانـــی گەلەکەماندا خولقاوەو خاسیەتێکی تایبەتی نەتەوایەتی خۆی وەرگرتووە کە بە ئاسانی لـــە ئاوازی نەتـــەوە دراوسێکانی جودا بکرێتەوە ، وەك ئاوازەکانی ڕاستو سێگاو چوارگاو پێنجگاو عەجەمو بەیاتو حیجازی کوردو موحەیبەرو ئورفەو نیوەشەو ئاوازەکانی تـری لاوکو حەیران‌و بەستەی خۆماڵی .

شاعیری نەتەوەیی کورد [ ئەثیری = ئەســیری ۱۸۹۰ ـ ۱۹٦۲ ] وەك شارەزایێکی ســازو ئاوازی کوردی هەستی بەوە کردووەو ، هەندێ لەو ئاوازە کوردی‌یانەی لە ناو هۆنراوەیەکی بە ناونیشـــانی « ڕۆڵەیی کوردم » ناو هێناوەو دەڵێ :ـ

کابرا مـــەڕوانە ماڵو خانـــەیی وێرانی مـــن
تێبگە تەحسیل‌و کەسبو کردەوەو عیرفانی من
ئیدیعایی عیلمی موسیقای ئەمن نیســـپات ئەکا
ڕاستو سێگاوو بەیاتو لاوکو حەیرانی من (۲)

وە لە ئامێرەکانی موسیقاش، گەلی کورد ئاشنایەتی لە گەڵ ئامێری موسیقای ڕۆژهەلاتی وەکوو [ دەفو دەهۆڵ‌و زوڕناو بلوێرو شمشاڵ‌و کەڕەناو دوو زەلەو باڵەبان‌و عودو سازو سەنتوورو جونبوش‌و چەنگ‌و زیل‌و بەم ] بووەو ، گۆرانی بێژە هونەرمەندەکانی ، ئاوازی گۆرانی‌و مەقامەکانیان پێ ساز کردوون .

**میراتێکی یەکجــار کۆنی ڕابوردووی کۆیەیە ، نوێ بووەوەو بووژایەوە ، جگە لەکۆیە جێگەی دیکــەش هەبووە لە کوردستان مەجلیسو ڕابواردنی وەهــای تێدا بووە ، بەلام گومانم لەوە دانیە لە ڕووی وەستاییو هونەرکاری‌یەوە هاوتای دانیشـــتنەکانی دیوەخانی ئەمین ئاغا یەکجار کەم هەبووە .**

چونکە ڕێکەوت وا بوو ئەمــین ئاغا بۆ خۆی شـعرێکی هێژا بووە لە کوردیو فارسیو بەشێکی زۆری لە بەیتــی گۆرانیو بەســتەکانی خـــۆی دەیهۆنیەوە . ئەوەی خەلکی دیکەش هەلی بەستبان بە پێش چاوی ڕەخنەگرو تیگەی پڕ هونەری ئــەودا تیپەڕ دەبوو ، ئەوجا دەبوون بـــە گۆرانیو دەخرانە قلبی مۆسیقاوە . «(٥)

بۆیە ئەو شاعیرو زانایانەی دۆونشینی ئەمــین ئاغای ئەختەر بوون هــەر لە حاجی قادری کۆیــی ( ١٨١٦ ـ ١٨٩٧)(٦) ز و ( حاجی مەلا عەبـدوللای جەلی‌زادە ١٢٥٠ ـ ١٣٢٦ ك (٧) وە بگرە تاکو دەگاتە شـێخ ڕەزای تالـەبانی ١٨٣٢ ـ ١٩٠٩ ز «(٨) و کەیفی جوانرۆیی‌و موجرمی شاعیر ( ڕەشـید ئاغای حاجی بەکر ئاغای برای ئەختەر هەموویان لە پال زانستو ئەدەبەکەیانەوە . نەك هەر بنچینەیێکی باش. بەلکوو زانیاری‌یەکی تەواویشیان بووە لە هونــەری مۆسیقاو مەقاماتی کوردی . بۆیە شــیعرەکانیان وا سوارو مۆسیقادار بوون و بەئاوازی خۆشی مەقامی کوردی ئەو کۆڕو دانیشتنانەی ( ئەختەر ) دا . لــە لایەن مەقامبێژی بلیمەتی کورد ( مەربێن ) ی ( قەشــە شابیل ) دوە بە دەنگە زولالەکەی گوتراون .

جگە لە شیعری ئەو کەلە شاعیرە هونەرمەندانە. بە دەیان بەیتو گۆرانی بە نرخی فولکلۆری بە ئاوازی مەقامی رەسەنی کوردی‌یەوە بە سەر زارو زمـــانی ( مەربــێن ) ی دەنگ خۆش. مەقامبێژە هــــاو چەرخەکانی‌یەوە بوونو لە دوایشدا کەوتوونەتــە سەر زمانی شاگردە زیرەکو هونەرمەنــدەکانی وەکوو حەننا تۆما ( حەنیل ) و ( نەشئەتی ڕەشـید ئاغا ) و ( حاجی‌یە گەورە ) و ( شێخ نەجمەددینی شـــێخ کەریمی بەرزنجی ) و ( حوسەینی ) ی شاعیری دلتەڕی برایو عەبەی چایەچی هەردەم ئاهەنگی بەزمو شاوبی تایبەتیو کۆڕو کۆبوونەوە ئایینی‌یەکانی ئەو شـــارە زیندوودیان پێ گەرمو پڕ جۆشو خرۆش کردووە .



# « مەربێن » ی مامۆستای بلیمەتی مەقامی کوردی

**مەربێن لە دیانەکانی شاری کۆیە بووەو کوڕی ( قەشە شابیل ) ی مامی باوکی « یاقووبەی باسێ » ی موو ڕیس بووە(٩) ، ئەم یاقووبەیە هێشتا لەژیاندا ماوەو تێر تەمەنەو لە کەرکووك دادەنیشێ ( لە ١٨٠٢ دا لەکۆیە لەدایك بوە ) .**

**وەك لە هەندێ لە برا دیانە بە تەمەنەکانی کۆیەم بیستووە ، مەربێن هاوتەمەنی ئەمین ئاغای ئەختەری شاعیرو مەقامزانی کوردی بووەو ، دەتوانین بلێن : لە دەورو بەری سالی ١٨٣٥ ی زایینی لە کۆیە لە دایك بووەو هەر لەوێش لە دەوروبەری ١٨٩٥ دا ، کۆچی دوایی کردووەو لە گۆڕستانی هەرمۆتە بە خـــــاك سپێردراوە(١٠) .**

ئەو بەیتو گۆرانی‌یە کوردی‌یە خۆشانەی کــە تا ئەم دوایی‌یە بە سەـــر زارو زمانی گۆرانی بێژە هەلکەوتووەکانی ئەو شارەی کۆیەوە بوون . هەموویان هەر خولقـــاوو زادەی داڕشـــتن یا نوێ‌کردنەوەو ڕێکخستنی سەر دەمی ئەمین ئاغای ئەختەرو مەربێنی مەقامبێژی بلیمەت بوون . ئەو مەقامانەی (نیوەشەو) و (سەحەر) و (بەهار) و (پایز ) و (گولێ) و (ئایشەگول) و (شەنگ‌مێرەم) و (مەکەن مەنعی عاشقان) و (حەبارە) و (شلەو خانان) ی شایی ڕۆینەی کوردی، کە لە لایەن گورانی بێژە هونەرمەندەکانی وەك :

(نەشئەتی ڕەشید ئاغا) و (حەنیل) و (عەبەی چایەچی) و (سێوە) و (مەلا ئەسعەد) تا دوا دوای

پەنجاکان دەگوتران ، ئەگەر هەمووشیان لەو شارەی کۆیە دا نەهاتبن ، ئەوا بێگومان هەندێکیان خولقاوی ئاوو هەوا هونەرییەکەی بوونو ، بە تێکڕاش لە بواری کۆڕو دانیشتنەکانی ئەمین ئاغاو مەربێنی هونەرمەند ڕێکو پێکتر کراونو خراونەتە ناو قالبی مۆسیقاو ئاوازی ڕەسەنی کوردییەوە .

ئەگەر ئێمە سەرنجێك بدەینە ئەو مەقامانەی مەربینی هونەرمەندو ، ئاوڕێکیش بدەینەوە لە سازو ئاوازی ئەو گۆرانی و بەیتانەی کە نزیکن لێیانەوەو ، ئێستا لە ناوچەی موکریاندا دەگوترێن ، بە ئاسانی جیاوازی نێوانی هەر دووکیانمان بۆ دەردەکەوێ و ئەو ڕاستییەمان ڕوون دەبێتەوە کە ئاوازو دەقی مەقامەکانی (مەربێن) لە سەرەتادا لە ناو ئاوو هەوای ژیانێکی شارستانیی پڕ لە هاتو باتی بازرگانیو لە ناو کۆڕو دانیشتنی شارەزایانی ئەدەبو هونەری کوردی سەردەمی ئەختەرەوە سەریان هەڵداوەو ئاوازو دەقی مەقامەکانی ئەمو دیویش زادەی ئاوو هەوایێکی ترنو دەنگدانەوەی ژیانی کۆمەڵگای کشتوکاڵینو ڕەنگدانەوەی نەریتی ژیانی دەستەکییانەیان پێوە دیارە . بۆیە دەتوانم بڵێم : شاری کۆیە لە کۆنەوە ئەگەر سەرچاوەیێکی هەرە سەرگاری سازو ئاوازو گۆرانی کوردیش نە بووبێ ، ئەوا کاروانسەراو قۆناغێکی سەرەکی بووە لە سەر ڕێی کاروانی سازو ئاوازو گۆرانی ڕەسەنی کوردی .

مەربێن دەنگێکی زوڵاڵی سیحراوی هەبوو ، کە شەو رادەشکاو بای شەماڵ شەوانی هاوینی کۆیەی فێنك دەکردەوە ، ئەو مەقامبێژە بلیمەتە بە دەنگە دلکێشو خۆشەکەی مەقامی (نیوە شەو)و(سەحەر)ی لە دیوەخانی ئەختەری شەیدای هونەری کوردی دەگوت هەموو دانیشتوانی شاری کۆیە لە خەو ڕاست دەبوونەوەو گوێیان لەو دەنگە خۆشەی مەربینی هونەرمەند دەگرت(١١) .

وەك لە هەندێ لە شارەزایانی مەقامی کوردی ئەو شارەم بیستووە (١٢) ، مەربێن برایەکی لە تافی لاویدا جوانەمەرگ دەبێ ، خەڵکی کۆیە بە دوکاندارەوە لە دوای تەرمەکەی تاکو گۆڕستانی گوندی هەرمۆتە دەڕۆن و (مەربین)یش هەموو جلو بەرگی خۆی لە خۆم هەڵدەکێشێو تەرمی برا جوانە مەرگەکەی بە خاك دەسپێردرێ ، ڕوودەکاتە حەشاماتەکەو پێیان دەڵێ : « خەڵکینە من بۆ دواجار لە ژیانمدا گۆرانیتان بۆ دەڵێم ، جا هەر گۆرانیو مەقامێکی ئارەزووی دەکەن ، داوام لێ بکەن بۆتان دەڵێم ، چونکە ئەوە دوا جارە کە گۆرانی بۆ ئێوە و بۆ (ئەختەر) و دانیشتوانی مەجلیسەکانی بڵێم !! ئیتر دوای ئەم کارەساتە (مەربین) چیتر گۆرانی نەگوتو مەیدانی ئەو هونەرە جوانەی بۆ حەنیلو لە دوایشدا بۆ (سێوە)ی مەقامبێژمان چۆڵ کرد(١٣) .

**پەراوێزو سەرچاوەکانی ئەم باسە :**

**(١) پێشەکی توحفەی موزەفەرییەی نوسکارمان ــ سەعکرد… هێمن ، ل٨ ، بەشی (١)**
**(٢) ئەسیری ــ کەریم شارەزا جەبار جەباری ــ هەولێر ١٩٧٤ ، ل٦٥**
**(٣) گۆڤاری (بەیان) ی ژمارە (٤٧) ی ساڵی ١٩٧٨ ل٦٠**
**(٤) حاجی قادری کۆیی ــ بەشی یەکەم ــ مەسعوود محەمەد بەغدا ١٩٧٣ ل٢٠٦**
**(٥) هەر ئەو سەرچاوەیەی پێشوو ، ل٢٠٧**
**(٦) مێژووی ئەدەبی کوردی ، چ ٢ ، عەلائەددین سەجادی ــ بەغدا ١٩٧١ ، پەراوێزی ل٣٤٤ ، پشت بە سەرچاوەیەکی ( د. کەمال فوئاد ) بەستراوە**
**(٧) کۆیەو شاعیرانی ــ کەریم شارەزا ــ بەغدا چاپخانەی النجوم ١٩٦١ ، ل ٣٢**
**(٨) گۆڤاری کۆلیجی ئەدەبیات ــ ووتارێکی دوکتۆر عیزەدین مستەفا ڕەسوول ژمارە (٢٢) ساڵی ١٩٧٩ ، ل٣٦ ، کە ئەویش پشتی بە ووتارێکی (حەمەبۆر) لە ڕۆژنامەی (العراق)ی ژمارە ٦٣٢ بەستووە**
**(٩) ئەم زانیارییەم لە مام (گۆرگیس)ی خواجە یوسفی کۆیی وەرگرتووە کە ئێستا لە ژیاندا ماوەو لە ساڵی ١٨٩٨ دا لە کۆیە لە دایك بووە.**
**(١٠) هەر ئەو سەرچاوەیەی پێشوو .**
**(١١) ڕۆژنامەی هاوکاری ــ ووتارێکی خوا لێخۆش بوو (محەمەد تۆفیق وردی) لە سەر (مەربێن دەنگ خۆش)، ژمارە (٢٧) ی ڕۆژی ١١ـ٧ـ٩٧٠**
**(١٢) لەو شارەزاو ئاگادارانە :**
**( أ ) مەقامبێژی خوا لێخۆشبوو وەستا (محەمەد ئەمینی کوڕی وەستا ساڵحی**

**کەبابچی)کە لە ساڵی ١٩٠٧ دا لە کۆیە لە دایك بووەو لە ساڵی ١٩٧٣ دا لە شاری هەولێر کۆچی دوایی کردووە .**

**(ب) خواجە (حەننا سلێمان)ی دانیشتووی گوندی هەرمۆتەی نزیك کۆیە ، کە لە ساڵی ١٩٠٨ دا لە دایك بووەو ، ئێستا لە ژیانـــداماوەو ئاگاداری ئـــەم جۆرە هەواڵانەیە .**

**(١٣) ڕۆژنامـــەی هـــاوکاری ژمـــارە (٢٧) ی ڕۆژی ١١ـ٧ـ٩٧٠ (مەربێن دەنگ خۆش) بە پێنووسی خوا لێ‌خۆش‌بوو (محەممەد توفیق ووردی) .**

## کۆیەو کاروانی ئاوازو گۆرانی‌ی کوردی

## ( ٢ )

سێوە مەقامبێژێکی هونەرمەندی کورد بوو ، خاوەنی ڕێبازێکی هونەریی تایبەتی بوو لە مەقـــام گوتندا ، دەنگێکی خۆشی قەبەی گونجاوو لە باری هەبوو بۆ گوتنی ئەو جۆرە گۆرانی‌یانە ، هەستێکی مۆسیقایی ناسکی هەبوو ، بە هەوڵدانێکی کەم توانی خۆی بکا بە ئاشنای هەموو جۆرە موسیقایەکی ڕۆژ هەڵاتی ، لە کاتی گۆرانی گوتندا بە چاکـــی لەگـــەڵ مۆسیقادا دەڕۆیشت‌و دەیزانی لە کوێ‌رە دەست پێ‌بکاو لە کوێ‌وەش بوەستێ ، دەقی ئەدەبی‌و ئاوازی مەقامەکانی لە سەرچاوێکـــی پاك‌و ســـازگاری کوردەواری‌یەوە هەڵقـــوڵاون‌و بـــە زۆری لـــە گیروگرفتەکانی لاوان‌و ئەڤین‌و ڕاستگۆیی‌و وەفاداری‌و سروشتی خاکی کوردستانەوە دەدوێن‌و ڕەگێکـــی قووڵ‌و قایمیان هەیەو بە ناو ویژدان‌و دەروونـــی میللەتدا چۆتە خوارەوەو لە زۆر شوێندا لەبازنەی تەسکی کات‌و ڕۆژگار دەچنە دەرەوە ، بۆ ئەوەی بـــۆ هەموو دەورو سەردەمێکی مرۆڤی کورد دەست بدەن، بۆیە بە گۆرانی‌و مەقامی ڕەسەنی کوردی دەدرێنە قەڵەم .

هەر چەندە ئەو مەقامانەش ، بە دەقی ئەدەبی‌و ئاوازەکانیانەوە ، ڕەگ‌و شادەماریان دەچێتەوە سەر مەقامەکانی سەدەی نۆزدەهەم‌و بۆ سەردەمی ئەمین ئاغای ( ئەختەر )ی شاعیری هونەرمەند و (مەربێن)ی مامۆستای مەقامی کوردی ، بەڵام ئەو ڕاستی‌یە ئەوە ناگەیێنێ کە ئاوازی مەقام‌و گۆرانی‌یەکانی ( سێوە ) کت‌و مت هەر هەمان مەقامی ئەو سەردەمەی پێشوو بووبن‌و هیچ گۆرانکاریەکیان بە سەردا نەهاتبێ !!

چونکە هەر وەکوو ئاشکرایە ئەدەب‌و هونەرو ڕۆشنبیریی ئاوێنەی باڵانمای ژیانـــــی ئابووری‌و کۆمەڵایەتی گەلان‌و بەپێی قۆناغ‌و گۆڕانی باری ژیان ئەوانیش دەگۆڕێن‌و پێش دەکەون‌و گەشە دەکەن . لە سەرێکی دیکەشەوە ( سێوە ) خۆی مەقامبێژێکی هونەرمەندی بە دەسەڵات بوو ، بە بیرو ڕای گەلێ لە گۆرانی بێژە شارەزاکانمان ، توانای داهێنانـــی ئاوازی نوێ‌و تازەکردنەوەی ئاوازی فولکلۆریی کۆنی هەبووە ، بە زیاد کردنی شتی تازەو لابردنی نەغمەی سوواوو نەگونجاو لەگەڵ بابەتی مەقامەکەدا (١) .

**بۆیە لە کاتی گۆرانی گوتندا هەمیشە زاڵ‌بوو بە سەر ئاوازی مەقامەکانی‌دا ، بـــە توانســـتی‌ی هونەریی خۆی دەسکاری تێدا دەکردن بەبێ ئەوەی لە سنووری گشتی‌و لە بنچینە سەرەکی‌یەکانی ئەو مەقامانەش بچێتە دەرەوە (٢) .**

سێوە لە سەرەتادا هونەری مەقامی کوردی لە (ئەشئەتی ڕەشید ئاغای حەوێزی ) یەوە فێربووەو ، لە دوایدا بۆ ماوەی ساڵێك چۆتە لای (حەننا تۆما)ی ناودار بە ( حەنیـــل ) ی شـــاگردی ( مەربێن ) ی ئوستادی هەرە گەورەی مەقامی کـــوردی لـــەو مەڵبەندەی کۆیە ، لە سەدەی نۆزدەهەمدا . لە ماوەی ئەو ساڵەدا هەموو دەستوورو بنچینەکانی مەقامـــی کوردی بە دەقی ئەدەبی‌و ئاوازەکانی‌یـــەوە ، بـــە نووسینەوەو لەبەرکردنەوە فێربووەو (٣) ، بووە بـــە مەقامبێژێکی هونەرمەنـــدی لێ‌هاتـــووی کوردو ، بەزۆری لەگەڵ گۆرانی بێژەکانی ئەو سەردەمـــەی کۆیەی وەك ( عەبەی چایەچی ) و ( میناس مەربێن )و ( مەربێنی قەشە ) و ( مەلا ئەسعەدی کۆیـــی ) و ( ئەحمەدی حەمە مەلا ) و ( ئەمینی سەمەن ) مەقامی خۆش‌و دڵکێش‌و هەندێ جاریش بە دوو قۆڵی لەگەڵ ( میخەی یوسفی هەرمۆتەیی ) دا بەیتی ( مەم‌و زین )و ( ناسرو ماڵ‌ماڵ ) یان بە ( شیوە موکریانی‌یەکـــەی ) دەگوت . تا وای لێ‌هات لەو شارەدا بوو بە میرات گری لێ‌هاتووی ( مەربێن ) و (ئەشئەتی ڕەشید ئاغا)و

( حەنیل ) لە هونەری مەقامی کوردی‌داو ، هیچ کۆڕو ئاهەنگێکی ئەو شەرە بەبێ دەنگی سێوەو مەقامە خۆشەکانی شەوق‌و شادی تێدا نەدەگەڕاو ، هەستی هونەریی هونەر پەروەرانی پێ مەستو مەدهۆش نەدەبوو . هیچ شایی‌و ئاهەنگی نەورۆزو بەهارانیش بە بێ ئاوازی گۆرانی‌ی ( جەبارە وجەبارە ) و ( شلەو خانان )ی خاڵە سێوەی هونەرمەندمان ، هەوای عیشق‌و شەیدایی دەخستە کەللەی سەر چۆپی کێش سەر گەرمی ئەڤینی یارە نازدارەکەی‌و مەستی خۆشی‌ی بەهەشتی گوڵزاری بەهاری نیشتمانە خۆشەویستەکەی .

بەم جۆرە ( سێوە ) لەو شارە خنجیلانە زیندووە کورد ، لە دەرگەیێکی فراوانەوە ، چووە ناو مەیدانی هونەری ئاوازو گۆرانی کوردی یەوەو ، وەستایانەو لە سەرەخۆ چووە پێشەوە ، تا هونەرمەندیی خۆی‌و ڕەسەنیی ئاوازو مەقامەکانی بە هەموو خەڵکی ئەوشارەو سەرتاپای کوردستان ناسدووەە .

## چاو پێداخشاندنێکی خێرا بە تۆماری تەمەنی هونەرمەندا :ـ

سێوەی مەقامبێژی هونەرمەندی کوردمان ، ناوی تەواوی ( صلیوە )ی (٤) کوڕی خواجە یەلدەی کوڕی صیلوەیە ، لە ساڵی ١٨٩١ دا لە شارەکەی کۆیە هاتۆتە دنیاوەو چاوی ژیانی بە جوانی باخ‌و سەیرانگاکانی هەرمۆتەو ئاشان‌و ئۆمەرخوچان کراوەتەوەو گوێچکەشی بە ئاوازی کەوو سوێسکەی قەد پاڵی چیای باواجی‌و هەیبەسولتان‌و چریکەی بولبولانی شیوی ڕەزانی گۆش‌بووە .

لە ساڵی ١٩٠٢ دا خراوەتە بەرخوێندن لە لای ( قەشە گۆرگیسی ڕەبەن ) و لەبەر زیرەکی‌و زەین ڕوونی بە ماوەی پێنج ساڵ بە چاکی بنچینەکانی ئایینی مەسیحی‌و زمانی کلدانی‌و سەرەتایێك لە زمانی فەرەنسی فێردەبێ‌و لە خوێندنەکەیدا دەگاتە پلەی « شەماشە » و ، لە لاوەش بە یارمەتی هەندێ لە دۆستە خوێندەوارەکانی بە باشی فێری خوێندنەوەو نووسینی کوردی‌و عارەبی‌و فارسی دەبێ‌و ، ئاگاداریێکی باش لە شیعری کوردی‌و عارەبی‌و فارسی‌و پەیدا دەکات ، بۆیە بە دەیان چامەو هۆنراوەی کوردی‌و فارسی لەبەربوون‌و بە مەقام‌و بەستە دەیگوتن ، وەك شیعرەکانی ( قاصد ) و ( ئەختەر ) و ( حاجی قادری کۆیی )و ( وەفایی )و ( عەبدوللا بەگی مصباح الدیوان )و ( صافی )و ( دلدار ) .

**لە ساڵی ١٩٠٣ دا خواجە ( یەلدە )ی باوکی بە نەخۆشی‌ی ڕشانەوە ( کۆلێرا ) کۆچی دوایی دەکات‌و، سێوەی دەستە کوڕیش بۆ گوزەران‌و بەڕێوەچوون دەبێتە شاگردی ( خواجە یوسف ) ی مووڕێس‌و جۆلای دۆستی نزیك‌و دلسۆزی باوکی‌و ، لە ماڵەوە لەگەڵیاندا دەژی ، کە دەگاتە تەمەنی هەرزەکاری ، دەکەوێتە داوی دڵداریی کچە جوان‌و نەشمیلانەکەی وەستاکەی کە ناوی ( وارێ ) (٥) بووە ،** ئەو ئەڤینداری‌یەشی لەگەڵ ( وارێ )ی ناسك‌و نازداردا ، بووە بە مایەی تەقینەوەی بەهرەی هونەری مەقامبێژی‌یەکەی ، بە تایبەتی کە هەستی کردووە ( وارێ ) ی دڵڕفێنیشی ئەو حەزو دڵداری‌یەی لە گەڵدا ئاڵوگۆڕ دەکات بۆیە بە شەوو ڕۆژ گۆرانی دڵداری لەدەمدا نەبڕاوەو سەرتاپای ئاوازی گۆرانی‌یەکانی هەر سۆزو عیشقە نەمرەکەی بووە بۆ یارە دڵ ڕفێنەکەی (٦)، کەچی لە ئەنجامیشدا، کە وەستاکەی هەستی بەوە کردووە کچەکەی پێ نەداوەو ، نەی هێشتووە بۆ یەکتری بن‌و داویە بە ( صلیوەی قەشە ئەلیاس ) ی خزمی خۆی‌و دوای کەمتر لە ساڵێك ( وارێ )ی ئاشقی دڵ سووتاو بە دەردی وەرەم ( سیل ) سەردەنێتەوەو ، سێوەی بەد بەختیش دوای چەند ساڵێك کچێکی خزمی خۆی بە نابەدلی پی‌دراوە (٧) .

سێوە لەکاتی گەنجێتی‌دا بۆ گوزەران‌و ماڵ بەڕێوەبردن پشتی بە پیشەی مووڕێسی‌و جۆلایی بەستووەو ، لە دوایدا لە کلێسا بچووکەکەی کۆیەدا بووە بە ( شەماشە ) و ، بە زۆری بەڕێوەبردنی ئەو کلێسایە هەر لە ئەستۆی ئەو بووەو (٨) ، لە هەمان کاتیشدا دەبوو بە نووسەرو میرزاو حیسابگری بازرگان‌و خاوەن زەوی زارو توتن چێنەکانی کۆیە(٩).

سێوە پیاوێکی کە لەگەتی مەیلەو قەڵەوی چاو گەورەی لووت خڕو ، زۆر دڵتەڕو زەوقانی ونوکتەزان‌و قسە لەمستبوو . زۆر حەزی لە کۆڕو دانیشتنەکانی خواردنەوە دەکردو بە زۆری دۆست‌و هەڤاڵەکانی ژیانی لە دەستەی گەنج‌و جاحێڵەکانی شارەکەی بوو ، نەی دەویست پێی بڵێن پیربوویی

بۆیە هەڵسانو دانیشتنی لەگەڵ ئەوەی نوێو ئەهلی زەوقدا بووەو ، هەردەم سەرچۆپی کێشی شایی ڕۆینەی کوردیو مەقامبێژی شاییو ئاهەنگەکانی نەورۆزو سەیرانەکانی شارە جوانەکەی بووە ، هەر ئاهەنگێکی سێوە بەشداری تێدا نەکردبێ وەك چێشتی بێ خوێ بووە ، تامی تەواوی لێ وەرنەگیراوە . بەم جۆرە سێوەی هونەرمەند تا دوا هەناسەی ژیانی هەر لە خزمەتی هونەری مەقامو گۆرانی کوردی دابووە ، تا لە ڕۆژێکی ساردی مانگی کانوونی دووەمی ١٩٦٤ داو لە تەمەنی ٧٣ ساڵیدا لە کۆیەماڵ ئاوایی لە هونەری کوردیو لە دۆستو یارانی کردو ، هەر ئەو ڕۆژە تەرمەکەیبە شانو بازووی خزمو دۆست هونەر پەروەرانی ئەو شارە بردراوە بۆ گۆڕستانی « هەرمۆتە » ، لەوێ بە خاکی نیشتمانەکەی سپێردراوەو مەیدانی هونەری ئاوازو گۆرانی ڕەسەنی کوردی بۆ هونەرمەندە لاوەکان چۆڵ کردووە .

**سێوەی هونەرمەندلە کاروانی ئاوازو گۆرانی کوردی دا :**

سێوە لە سەردەمی گەنجێتیدا هونەرەکەی لە چوار چێوەی کۆڕو دانیشتنی دۆستو یارانی نەدەچووە دەرەوە ، تاکو چلەکان لەگەڵ هەڵچوونی هەستی نیشتمان. پەروەریی میللەت،ئینجا هونەرەکەی کەوتە سەر شانۆی ئاهەنگەکانی نەورۆزی کوردو دەنگی دایەوەو سەر لە نوێ گۆرانی ( جەبارە )و ( شلەو خانان )ی شایی ڕۆینەی زیندوو کردەوەو گۆرانی [ لە بەر نازی چاوبازان ]ی وەفایی کرد بە مەقامی تایبەت بە بووك گواستنەوەو ، مەقامی ( مەکەن مەنعی عاشقان ) و ( بە قامەت خەرامانی )ی صافی هیرانیو ( زولفو ئەگریجەی یار )ی یونس دلداری شاعیری نیشتمان پەروەری کرد بە گۆرانی بە ڕەواجی ناو کۆمەڵی هونەرپەروەرانی ئەو شارە زیندووەی کۆیە .

سێوە لە سەرەتای پەنجاکاندا پێنج مەقامی لە مەقامە ڕەسەنەکانی خۆی لە ئیستگەی ڕادیۆی عیراق ـ بەشی کوردیدا تۆمار کردووە کە ئەمانەن:ـ ( عەجەم : سەحەر ) و ( حیجاز : گورێ ) و ( بەیات : ئایشە گوڵ )و ( حیجاز : بەهار ) لەگەڵ مەقامی ( شەنگ مێرەم ) دا ، لە مانە مەقامی پێنجەم نەبێ ، دەنا ئەوانی دیکە ناو بەناو لە ئیستگەی کوردییەوە لێ دەدرێن (١٠) .

لە سەرەتای ساڵی ١٩٥٨ دا ، کە ( کۆمەڵی بووژاندنەوەی هونەرە جوانەکان ) لە کۆیە دامەزرا ، ( سێوە ) بە ئەندامی فەخری ئەو کۆمەڵەیە وەگیراو ، جمو جووڵی هونەریی خۆی بە پێشکەش کردنی مەقامی ڕەسەنی کوردی لە شارەکانی ( کۆیەو سلێمانیو ڕانیە هەولێر ) دا نواندو لە هەموو لایەکدا دەنگی دایەوە .

لە هاوینەکانی ١٩٥٨ و ١٩٥٩ دا ، ( سێوە ) و ( باکووری ) بە ناوی کۆمەڵەی بووژاندنەوەی هونەرە جوانەکانی کۆیەوە ، لە یەن ( کۆمەڵەی هونەرە جوانەکانی سلێمانی ) و ( تیپی مۆسیقای مەولەوی ) بانگ کراون بۆ سلێمانی بۆ شداری کردن لە ئاهەنگەکانی ئەو کۆمەڵەو تیپە موسیقییە ، (سێوە)ی هونەرمەرمەند بە یارمەتی مۆسیقای هونەرمەندان ( قادر دیلان ) و ( ولیەم یوحنا ) و ( نەجاتی عەبدە )و ( باکووری )مەقامە خۆشە کانی خۆی بە هەموو هونەر پەروەرێکی ئەو شارەی سلێمانی ناساندوەو ، هەموو جارێ خەڵکێکی زۆر لە پیاوە بەتەمەنەکانی ئەو شارە هاتوون بۆ گوێ گرتن لە مەقامەکانیو گوتوویانە خاوەنی ئەم دەنگە خۆشە میرات کری « ئەحەی ناسرو سەید عەلی ئەسغەرو مەلا کەریم »ە.

**کاتێ کەشمویش دەرەنگ داهاتووە ، خەڵکەکە لە باغچەی یانەی فەرمانبەرانی ئەو شارەدا ، بە ئاوازی مەقامەکانی ( سێوە ) و قەتارو ئەللاوەیسیی ( ڕەشۆڵ عەبدوللا ) ڕۆژیان کردۆتەوە (١١) .**

لە ساڵی ١٩٦٠ یشدا ، دوای هەفتەیەك ئاهەنگ گێڕان لە سلێمانی لەگەڵ باکووریو قادردیلانو ئەندامانی هونەرە جوانەکانی سلێمانی بەرەو شاری هەولێر هاتوونو ، لە ڕێگادا هەر لە سلێمانییەوە تاکو دەگەنە هەولێر ( سێوە ) بۆ پرۆڤە کردنی ئاهەنگی شاری هەولێر ، لە سەر ئاوازی کەمانجەی ( قادر دیلان )ی هونەرمەند ، مەقامی هەمە جۆری کوردی گوتووەو لە هەولێریش بۆ ماوەی دووشەو لە هۆڵی گەلدا بە سەرکەوتوویی ئاهەنگی موسیقای سلێمانیو مەقامەکانی ( سێوە ) ی هونەرمەندی کورد ، لەم شارە مێژووییە پێشکەش کراوە .

سێوە لە کۆیەش تاتینی تێدا مابوو ، درێغی نە دەکرد لە بەشداری کردن لە ئاهەنگەکانی نەورۆزو

جەژنە نیشتمانی‌یەکانی عیراقو کوڕو دانیشتنەکانی دۆستو یارانی ، بە پێشکەش کردنی مەقامی ڕەسەنی کوردی‌و بەستەی پڕ جۆش‌و خرۆش ، بەمە دەورێکی باشی گێڕاوە لە مەیدانی هونەری ئاوازو مەقامی کوردی ناوی خۆی لە لاپەڕەیێکی گەشی مێژووی هونەری کوردی‌دا تۆمار کردووە .

**چالاکی‌یە هونەری‌یەکانی سێوە لە کلێسای کۆیەدا :ـ**

شەماشە سێوەی هونەرمەند لە کلێسا بچووکەکەی کۆیەدا ، شوێنێکی تایبەتی‌و دیاری هەبوو لە هەڵسووڕاندنی کاروباری ئایینی دیانەکانی ئەو شارە . لە کاتی نوێژکردن‌و قودداسەکاندا ، هەر دەنگو ئاوازەکانی ئەو بوون لە گوێی نوێژکەراندا دەزرنگانەوە . خەڵکەکە تام‌و چێژێکی زۆریان لە تەوشیح‌و مەزموورو گۆرانی‌یە ئایینی‌یەکانی وەردەگرت ، کە هەموو ئێوارەیەکی یەك شەمووان‌و لە جەژن‌و موناسەبەتە ئایینی‌یەکانیاندا بە دەنگە پڕجۆش‌و خرۆشەکەیەوە دەی گوت‌و دنیای دەهێنایە جووڵەو هەژان‌و ، خەڵکەکەی‌دەبردە دنیایێکی دیکەو دەی فڕاندن بۆ ئاسمانێکی پڕ لە ڕۆشنایی‌و گیانی پاکی پێغەمبەرو پیاوچاکان .

هەندێ لەو برا دیانانەی کە لەو کلێسایەی کۆیە لەگەڵ سێوەدا نوێژیان کردووە ، دەگێڕنەوەو دەڵێن (١٢) :ـ

یەکێك لە هەرە بەناوبانگترین گۆرانی‌یە ئایینی‌یەکانی کە لە موناسەباتی تایبەتی دەی‌گوتن گۆرانی‌یەك بوو بە ناونیشانی ( نقوم شەپیر ) بوو ، کە ماناکەی بە کوردی ئەمە دەگەیێنێ : ( با هەستین تەسبیحات بۆ خودا بکەین ) و لەسەر ئاوازی مەقامی حیجازی کوردی‌و لەسەر شێوەی مەقامی ( بەهار ) ی دەگوت ، بەجۆرێکی وا کە شارەزاترین کەس لە هونەری مەقامات نەتوانی وەکو ئەوی بڵێ‌و ، نە دەزانرا چۆن دەستی پێ‌دەکردو چۆنیش کۆتایی بەو ئاوازە خەمناکە دەهێنا

بەو دەنگە پڕ سۆزەی نوێژکەرەکانی ناوکلێسای بە جارێ دەهێنایە جۆششی گریان‌و فرمێسکی لە چاواندا نەدەهێشتن .

ئەو گۆرانی‌یەی ( نقوم شەپیر ) تایبەت بوو بە ڕۆژی ( هەینی ئەشکەنجەو ئازار ) کە بیرەوەری ڕۆژی لە سێدارەدانی حەزرەتی عیسایەو دەکەوێتە دوو ڕۆژ پێش جەژنی هەستانەی حەزرەتی مەسیح کە هەموو ساڵێ لە ڕۆژێکی یەك شەممەدا لە مانگی نیسان بە پێی حیسابێکی تایبەتی کلێسا ئەو جەژنە دەکرێ .

بەم جۆرە سێوە لەناو کلێساو لەکاتی جێ‌بەجێ کردنی نەرێتی ئایینی خۆشیاندا هەر ئاوازی کوردی بەکارهێناوەو تەوشیحی ئایینی‌و مەزموورەکانی ( حەزرەتی داود ) ی هەر بەو ئاوازانە دەگوت کە لە کۆڕو ئەنجومەنی تایبەتی‌و لە ئاهەنگی شایی‌و خۆشی‌دا گۆرانی‌یەکانی ( ئایشە گوڵ )و ( سەحەر )و ( نیوە شەو )و ( بەهار )و ( پاییز )و ( شەنگ مێرەم )ی پێ دەگوتن .

ئەوەی ڕاستیش بێ ، برا دیانەکانی کۆیەو گوندی هەرمۆتە ( کە کەوتۆتە لای خوارووی ڕۆژئاوای ئەو شارە ) لە چەند گۆرانی‌و تەوشیحێکی ئایینی بەو لاوە کە بەشێکن لە نەریتی دووعاو نوێژیان‌و بە زمانی سریانی دەگوترێن ، دەنا لە هەموو موناسەبەتێکی خۆشی‌و ناخۆشی ئەو کۆمەڵە ، چ لە ئاهەنگی خەنەبەندان گواستنەوەو بەنمی شەواوە ، چ لە بەندو سەردوولکەی تازیەی مردوواندا هەر گۆرانی کوردی‌یان گوتووەو لە لایان نەبۆتە شتێکی‌باو بە زمانە ئایینی‌یەکەی خۆیان گۆرانی بڵێن (١٣) .

لە بواری ئەم لێدوانەشماندا دەبێ ئەوە بڵێم : کە لەو کاتەی گۆرانی بێژە دیانەکانی ئەو مەڵبەندە سوودیان لە ئاوازی کوردی وەرگرتووە بۆ جێ‌بەجێ کردنی نەرێتی دووعاو نوێژی کلێسایان ، لە هەمان کاتیشدا نابێ ئەوە لە بیر بکەین کە مەقامی کوردی لە ناو ئاوازی مۆسیقاو ئیقاعی ناقووس‌و(تاس مەعرف)و دەنگی کەرەنای قودداسەکانی ناو دێرو کلێساکاندا لووس‌و لێکترو پاك‌و پوختر بوون‌و ، باشتر زاخاو دراون‌و ، بەڵگەی ئەم بووچوونەشم ئەو ئاوازە تایبەتی‌یانەی ( سێوە )ی هونەرمەندمانن کە لە سەردەمی ئەو ، لەو بەدەر هیچ هونەرمەندێکی دیکەی کورد پێی نەگوتراون وەکوو ئەو گوتوونی‌و لێی سەر نەکەوتوون .

**پەراوێزو سەرچاوەکانی ئەم باسە :**

(١) یادداشتە هونەری‌یەکانی ئەندرێوس خەممۆ

( باکووری ) کۆیە ١٩٢٨ ، دەست نووس ل ٥٠

(٢) هەر ئەو سەرچاوەیەی پێشوو ، ل ٥١

(٣) ئەم زانیاری‌یەم لە کاك شمعوونی خواجە یوسفی کۆیی وەرگرتوە کە لە سالی ١٩٠٤ لەدایك بووە

(٤) ناوی ( صلیوە ) لە ناو دیانەکانی کۆیەو هەرمۆتە بۆ خۆشەویستی‌و کورت کردنەوە دەکرێ بە ( سێوە )

(٥) ( واریّ ) کورت کراوەی ناوی ( وارینە )یە

(٦) گۆڤاری ( بەیان )ی ژمارە (٤٧)ی سالی ١٩٧٨، ل ٦١ ، باسێك لەسەر سێوە

(٧) ئەم زانیاری‌یەم لە کاك ( حەننا سولەیمان ١٩٠٨ )ی هەرمۆتەیی وەرگرتووە .

(٨) یاداشتە هونەری‌یەکانی ( باکووری ) ، ل ٥٤ ، دەستنووس .

(٩) گۆڤاری ) بەیان )ی ژمارە (٤٧)ی سالی ١٩٧٨، ل ٦١

(١٠) هەر ئەو سەرچاوەیەی پێشوو ، ل ٦١

(١١) یادداشتە هونەری‌یەکانی ( باکووری ) ل ٥٥

(١٢) ( باکووری )ی دۆستی خۆشەویستم ئەم رووداوو راستی‌یەی بۆ گێرامەوە

(١٣) ئەم زانیاری‌و راستی‌یەم لە سەرەتای مانگی شوباتی ١٩٧٩ دا لەم برا دیانانەی کۆیە وەرگرتووە : ــ

(أ) مەربێنی قەشە گۆرگیس کۆیە ١٨٩٢ ــ ئابی ١٩٧٩

(ب) گۆرگیس خواجە یوسف کۆیە ١٨٩٨

(ج) حەننا عەبدولکەریم کۆیە ١٩٠٠

(د) شمعونی خواجە یوسف کۆیە ١٩٠٤

(ه) حەننا سولەیمان هەرمۆتە ١٩٠٨

(و) شەعیەی مەربێنی قەشە کۆیە ١٩١٤

**[ سێوە لەناو ستۆدیۆی ئێستگەی‌عیراق بەشی‌کوردی لەمانگی نیسانی ١٩٥٢ دا لەکاتی تۆمار کردنی پێنج مەقامەکەی بەیارمەتی ئاوازی مۆسیقا ژەنەکانی ئەوسای ئێستگە : احمد الخلیل بە عود ، ئایقن بهنام بە نای ، قادر دیلان بەکلارنێت ، ابراهیم احمد بە جومبوش ، ناظم نعیم بەکەمان ، عبد الاحد جرجیس بە قانون . ] وەنەسرین‌شیروان لەگەلیان دانیشتووە .**

**ئەم وێنەیە لەسەر وێنەیێکی گۆڤاری ( اهل النفط )ی ژمارە (١٥)ی سالی (٢)ی ڕیکەوتی تشرینی یەکەمی ١٩٥٢ وەگیراوە**

## کۆیەو کاروانی ئاوازو گۆرانی‌ی کوردی

## ( ٣ )

## مەقامەکانی سێوەی هونەرمەند لە تەرازووی رەسەنایەتی‌دا

**ئێمە ئەگەر بمانەوێ نرخی راستەقینەی هونەری مەقام‌و گۆرانی‌یەکانی سێوەی هونەرمەندی کوردمان بزانین ، دەبێ ئەو تەرازووە هونەری‌یە هەست ناسکە بگرینە دەست‌و ئەو مەقامانەی بخەینە تایبەتی‌و پارسەنگی رەسەنایەتی هونەریشی بخەینە تایەکەی دی ، تا وەکوو سەنگ‌و گرانبەهایی ئەو هونەرەیمان بۆ نمایان بێ .**

ئەو ئەنجام‌و بریارەش هەموو کەسێك وا بە ئاسانی لێمان وەرناگری‌و قەناعەتی نایێ تا خۆیان بەشداری لەو هەلسەنگاندن‌و بەراوردکردنە نەکەن‌و بۆ ئەم هەنگاوەش وا باشە ئێمەو خوێنەری بەرێز گەشتێك بەناو دەقی ئەدەبی چەند مەقامێکی ئەم هونەرمەندەمان بکەین ؛ ئینجا بێینە سەر دەستوورو باسا دەرهێنانی ئەو رەسەنایەتی‌یەی مەقام‌و گۆرانی‌یەکانی چ لەرووی دەق‌و چ لە رووی ئاوازو گوتنەوە .

**گەشتێك بەناو دەقی ئەدەبی مەقامەکانی سێوەی هونەرمەندا : ــ**

سێوەی گۆرانی بێژی هونەرمەند لە ماوەی ژیانی‌ی هونەری‌دا بە دەیان مەقام‌و گۆرانی‌ی کوردی بە شێوە تایبەتی‌یەکەی خۆی گوتووەو ، ئەوەی من تۆمارم کردبێ (١٧) مەقام‌و گۆرانی کوردبن ، هەندێکیانی لە گەنجینەی ئەدەبی فۆلکلۆری کوردی وەرگرتووەو هەندێکیشیانی شیعری شاعیرە کلاسیکی‌یە ناودارەکانی کوردن . لێرەدا ئەو ماوەو بوارەمان نی‌یە تاکوو دەقی هەمووپانتان پێشکەش بکەین ، بۆیە بۆ نمونە دەقی چەند مەقامێکی ئەو هونەرمەندەتان دەخەینە بەردەست ، بۆ ئەوەی ئێوەی بەرێزیش بەشداریمان لەگەلدا بکەن لەم هەلسەنگاندنەدا

**١ ـ دەقی مەقامی گۆرێ :**

گۆرێ مەقامێکی حیجازی کوردییە ، لەسەر زمانی لاوێکی ئاشقی ( گۆرێ ) ناوێك یا کچێکی جوانی وەکوو ( گوڵ ) گوتراوە ، مەقامێکی چوار بەندییە ( بەش ) ەو ، دەنگدانەوەی شارستانێتی سەدەکانی پێشووی کوردستانەو ئەمەش دەقەکەیەتی : ـ

**ئەرێ گۆرێ ، گۆرە جوانێ**
**سینگ سپیێ مەمك فنجانێ**
**داك حەوودێ باب شاسەیوانێ**
**خواکەی گۆرێ**
**ئەگەر جەللادان لە من دەگرن چار گۆشەی مەیدانێ**
**چەرخەچی (١) شامشێریان (٢) دەردێنن لە کالانێ**
**تو عەشقی خودای بەوێ ڕۆژی جومعەیە**
**شەمووی بەسەردادێ**
**ئەوان گرتیان بەردە لە لەبەدیخانێ**
**گۆرێ لە باغانم نەمایی**
**خۆشی لە ساران دەست لە من بەردای !**

★ ★ ★

**ئەرێ گۆرێ ئەمان گور لە خەوێ هەر دەستی**
**شەنگێو شۆڕی بەژن برندێ پشتی دەبەستی !**
**ئەرێ برادەرینە**
**ئەگەر هەنیێ (٣) گۆرە جوانێ**
**لەبۆ من بمینێ بەوێ مانگی لە چاردەی**
**کە وەتانی لە مابەینی هەورو ساماری**
**جۆخین دەبەستی**
**داد گۆرێ لە باغانم نەمایی**
**خۆشی لە ساران دەست لە من بەردای .**
**ئەرێ گۆرێ گۆرە رەندی (٤)**

★ ★ ★

**مل بە عەباسی (٥) ، سەر بەسێ شایی (٦) کەونینە**
**قۆر بە بازیبەندی (٧)**
**ئەرێ برادەرینە هەر کەسانەکی**
**قسەکی لە مابەینی منو گۆرە جوانێ بکاتن**
**یارەبی حاری بە حاری کوڕی پاشای یەمەنێبی (٨)**
**کەوەتانی بە قسەی ( بەگرەی میرگەوەری )**
**کەوتیتە حەپسو لەگەل هەرامە بەندی**
**داد گۆرێ لە باغانم نەمایی**
**خۆشی لە ساران دەست لە من بەردای !**

★ ★ ★

**ئەرێ گۆرێ ئەمان گور ئەسمەرێ**
**کەزی زەرێ (٩) ، چاو سەفەرێ !!**
**تو خواکەی سەرت بینە دەرێ**
**لە تاقان ، لە پەنجەران لە شانشینان**
**لە چار کناران**
**بە کەرتت کردن جگەرێ ..**
**ئەرێ برادەرینە**
**ئەمن هەر چەندی حەکیمو لوقمانم**
**هاتبوونە سەرێ**
**هەموو حەکیمو لوقمانان دەرێن**
**برینداری گۆرێیمو پێی نابەین زەفەرێ !!**
**داد گۆرێ لە باغانم نەمایی**
**خۆشی لە ساران دەست لە من بەردای**

**٢ ـ دەقی مەقامی عایشە گور : ـ**

عایشە گور لە سەر ئاوازی مەقامی بەیات دەگوترێ ، لەسەر زمانی کچێکی ئاشقی لاوێکی دلدار گوتراوە ، بەڕای من ئەم مەقامە وەلامدانەوەی مەقامی « گۆرێ » یە ، بە هەردوو دەقەکە داستانێکی ئەڤینو وەفاداریی کوردی پێك دێنن .

لە بارەی ئەم مەقامەی (عایشە گور)ەوە هەندێ هەواڵو حیکایەتی وا هەیە ، لە زۆر ناوچەی هەولێر بلاوەنو خۆم لە چەند کەسێکی هەوار جیاوازم بیستووەو (١٠) دەڵێن « گوایە ئەو عایشەگولە بووکی بەردەی سەعید بەگی برازای میر سولەیمان بەگی میری سۆران بووە ، سەعید بەگ بەر لەوەی بچێتە بەردەوە ، بە فەرمانێکی گرنیگو بە پەلەی میرسولەیمان ، لەگەل دەستە سوارێك بەوەفد دەنێردرێتە ( ئەستەمبۆل ) بۆ دیدەنی سولتانی عوسمانلی ، تا دەگەرێتەوە ( عایشە گول ) تەون هەل دەخاو ، مافوورێکی چواردە گولی دەچنێو، لە چنینی هەر گولەیدا بەندێکی ئەو مەقامە هەل دەبەستێ، جا ئێرەدا دەقی ئەو مەقامەمان زادەی شاعیریەتی ( عایشە گولی ) خۆی بێ !! یان بەرهەمی شاعیرێکی دیکەی کورد بێو بە زمانی ئەوی دانابێ ، تا گەیشتۆتە سەردەمی ( حەنیل ) و ( سێوە ) تەنیا چوار بەندێ لێماوەتەوە . بەو حیسابەی ( بەند ) بەو بەشە مەقامە فۆلکلۆرییە دەڵێن ، هاو قوفڵ بن واتا هاو قافیە بنو کێشیشیان لە کورتەوە بۆ درێژ دەرواتو لە سەر بناغەی چەند جار دووپات کردنەوەی کێشی ( مفاعیلن ) دروست دەبێو (١١) ئەمەش دەقی مەقامەکەیە : ـ

ئای ئای ئای ئای
ئەگەر سەرێ من دەیێشی
دری عایشێی بابان وێرانی ناسەکنی
لەبەر هەرامە زوگرتی (١٢)
ئەگەر عایشە گور دەرێ
هەر کەسانەکی سوارە چووکەلانەکەی من ناناسی
ئەوەتانی قایمەو قایمەلانی (١٣) خۆی
داوێتەوە چۆمو چۆمارو سۆرە گرتی (١٤)

★ ★ ★

ئەگەر عایشە گور دەرێ
هەر کەسانەکی سوارە چووکەلانەکەی من ناناسی
ئەوەتانی سواری جوانیبە ماینەکی
بۆری ئەسعەد بەگیی کەوێتە
لە لایەکی دەرۆن جووتەکی توولەو
لەوی دیکەشی جووتە تاژی مل بە قەرێتە ‼

★ ★ ★

گەلی برادەرینە ئەمن ئەستێرەکم لێهەراتیە
لە لایێ رۆژ هەراتی
قەت لەدری من ئاوا نابی
ئەگەر عایشە گور دەرێ : ـ
ئەمن هەرچەندی چاوی خۆم دەگێرم
لە دوو سوارە چووکەلانە کەی من
بزر بوویتەوەو پەیدا نابێ
گەلی برادەرینە ئەمن چاك وەیە
دوگمەی سینەو مەمکێ خۆمی مار وێرانی بترازێنم
داخوا دەرێم بەلکی سوارە چووکەلانەکەی من
زیز بووەو قەت ئاشت نابی ؟ !

★ ★ ★

ئەرێ غەمگینیو غەم لەبەر عایشە گورێ
بابانو یرانو قەلەندەرێ ٠
سرا قەت کەسم نەمابوو
لەبۆ سوارە چووکەلانەکەی من هەر بە هیچی
گەلی برادەرینە ، ئەگەر سەرێ من دەیێشی
دەرێ عایشێ بابان وێرانێ نا سەکنی
لەبەر میراتە هەرامە زوگرتی ٠
ئەگەر عایشە گور دەرێ
هەر کەسانەکی سوارەکەی من نەدیتیەو ناناسی
ئەوەتانی قایمەو قالانی خۆی
داوێتە چۆمو چۆمەلان وسۆرەگرتی
بەرێ صەد حەیفەو موخابن
دەمکوژێتن لەوێ کۆنە دنیایێ هەر بە هیچی ‼
ئای ئای ئای ئای ٠

٣ ـ مەقامی شەنگ مێرەم :

ئەم مەقامە سەبارەت بە ناوهاتنی چەکی نوێی وەك تفەنگی شەشخان (١٥) ، لە هەمـــوو دەقـــی مەقامەکانی دیکەی سوە نوێتر هۆنراوەتەوە ، زادەی ئاوو هەواێیکی شارستانێتیو هاتو باتی بازرگانـــی سەدەی نۆزدەهەمی ئەو شارە زیندووەی کۆیەیـــە ، با بزانین دانەری دەقی مەقامەکە چ بە زمانی دایکـــی ( شەنگ مێرەم ) ەوە هەڵ دەبەستێ لە جوانـــیو ناسکو بەناز پەر وەردەیی کچەکەیداو ، خەریکـــە کراسێکی گرانبەهای بۆ بکرێ تا پێی بچێتە شاییو گۆوەندێ : ـ

ئەرێ شەنگێ ، شەنگە جوانێ
چاو سەقەرێ ، بالەبانێ (١٦)
داك حدوودێ (١٧) بێ نیشانێ
وەی لێ وەی لێ !

★ ★ ★

برادەرینە ٠٠ دەرێن ئەورۆکە جومعەیە
لە محلی نیوەرۆیێ
ئەگەر شەنگێ بەژن بڕندێ
دەچێتەوە سەر قەسرێ (١٨)
دوومین هەرامە سارنجێ (١٩)
ئەنگۆ لە بەژنێ شەنگێ بفکرن
چ عەیبانی نینەو عەیبی لێ مەگرن
چەند بە شیرنیو لاو چاکی
لە قۆری (٢١) هەرامە باونجێ (٢٢)

★ ★ ★

برادەرینە تاری لە دنیایێ
چەند لە درێ من رابوردن
ئەگەر هەنیێ شەنگ مێرەمێ
لەبۆ من بمینێ بەوێ مانگی لە چاردەی
کە وەتانی خەریك ماینەوە لە مابەینی هـــەورو ساماری
ئەگەر مەمکێ شەنگێ لەبۆ من بمینێ
بەوێ چار قوبەی ئالتوونێ ،
کە وەتانی عەلی بەگی داستی (٢٣)
دەیداتەوە لە چار گۆشەی هەرامە مەتاری ٢٤(٢٤)
برادەرینە ٠٠ ئەمن جوابەکی خێرێم زانی بوو
لە لای باش ئاغای لاوەندان (٢٥)

**دەرێن ماچی شەنگێ زیدە هەرزانە**
**ئەوەتا هاتینە سەر هەزار قەرە ڕیاری (٢٦)**
**وەی لێ ! وەی لێ !**

★ ★ ★

**برادەرینە .. دەرێن سێ بازرگان هاتینە**
**لە بەری قەتارچی‌یانە**
**دەرێن هەرسێکیان وەزیرن !**
**نا بەخوادی هەر سێکیان پاشانە !**
**دەرێن کراسەکیان پێ‌یە**
**لە بۆ شەنگ مێرەمێ زێدە هەرزانە !**
**وەی لێ ، وەی لێ !**

★ ★ ★

**تەتەر(٢٧) دێو رادەبری**
**داکی شەنگینم دەرێ : « تەتەر مارت وێران بی**
**قیمەتی ئەو کراسەی لەبۆ من برێ . »**
**تەتەر دەری : « قیمەتی ئەو کراسەم ئەوەتانە**
**بە پێنج صەد سەر بەردیلی(٢٨) بەر بەرانە**
**بە پێنج صەد ماینی کەحیلانە(٢٩)**
**بە پێنج صەد تفەنگی شەشخانە**
**بە پێنج صەد هۆقە ڕوونی تەیرانە !! »**
**داکی شەنگێم دەرێ :**
**« تەتەر مارت وێران بی**
**ئەگەر شەنگێ ئەو کراسەی**
**لەبەربکاتن‌و بچێتە شایی‌و**
**گۆەندێو سەیرانە**
**خەرکی ببینن داخوا دەرێن**
**چتۆ کچەتیمە ڕەزموانە !! »**
**وەی لێ ! وەی لێ !**

**مەقامەکانی سێوە لە تەرازووی ڕەسەیەتی‌دا : ــ**

ئێمە لە دوای سەرنجدان‌و هەڵسەنگاندنی ئەو مەقامانەی سێوەی هونەرمەندمان ڕاستی‌یەکی روون‌و ئاشکرامان بۆ دەرکەوت ، ئەویش ڕەسەنایەتی ئەو دەقە ئەدەبی‌و ئاوازە ئەمرانەی مەقامەکانێتی . کە سەنگ‌و نرخێکی گرانبەهایان هەیە لەناو گەنجینەی هونەری کوردیماندا‌و ، تای تەرازووی هونەری نەتەوەییمان باش ڕاست دەکەنەوەو دەتوانین پێوانەو نیشانەکانی ئەونرخ‌و ڕەسەنایەتی‌یەشی لەم چەند خاڵانەی خوارەوەدا کۆبکەینەوە :ــ

١ ــ مەقامەکانی سێوە ، بەدەقی ئەدەبی‌و بە ئاوازەوە ، لەناو ئاوو هەوایێکی سازگاری وڵاتی کوردستانەوە سەریان هەڵداوە، تۆمارو سیمفۆنیایێکی ڕاستگۆی ڕووداوە کۆمەڵایەتی‌و ڕامیاری‌یەکانی کۆمەڵگای کوردەوارین‌و بەپێی قۆناغ‌و ژیانی خەڵکەکە خولقاون‌و کەوتوونەتە سەر زمانی ئەو مەقامبێژە هونەرمەندەمان .

**٢ ــ بابەت‌و کەرەستەکانی هەمووی موڵکی کوردن‌و بۆ کورد گوتراون ، پڕن لە ووشەی ناسکی خۆشەویستی‌و ئەڤین‌و دڵپاکی‌و جوانی‌و ئازایەتی‌و سوارچاکی‌و ڕاستی‌و وەفاداری‌و مەردایەتی‌و فیداکاری ، کە هەموویان ووشەی چەمکی(٣٠)ئەمرن‌و هەمیشە کورد شانازی‌یان پێوە دەکات‌و تا هەتایێ لە نرخ ناکەون .**

٣ ــ شاعیری بەیت‌و بەندەکانی لە دەربڕینی ڕەوابنێژی‌دا ، بۆ دەرخستنی جێ‌چاکی‌ی ئافرەت‌و شۆخی‌و گورج‌و گۆڵی‌و گەردن هەڵکشاوی‌و چاو گەشی ، تا ماینی حدوودو کارمامزی مل بە قەرێتەو قورینگی گەردن بەرزو سەقەرو باڵەبان‌و کەوی وڵاتەکەی خۆی هەبووبێ ، بە گیانەوەری دوورە وڵات‌و نە بینراوی وەکو زەرافەو کەنگەرو تاوس‌و تووتی نەچواندووە .

**هەتا چۆم‌و چۆماڵ‌و ڕووبارو گۆڵ‌و گۆلاوی داوێنی شاخەکانی خۆی بووبێ ، بیری بۆ لای دەریاو ئاودڕو دوورگەو ئۆکەنو کەشتی‌یەوە نەڕۆیشتووەو ، تا لە دارو درەخت‌و گوڵ‌و گیاوگۆڵی بۆن خۆش‌و چنارو شەنگەبی‌و نارنج‌و لیمۆو سێو سووسن‌و بەیبوون‌و هەڵاڵەو ڕەشە ڕەیحانی باخی خۆی بووبێ ، دەستی بۆ دارو درەخت‌و گوڵی بێگانە درێژ نەکردووەو هەیکەلی دەقەکانی پێ هەڵ نەبەستوون .**

٤ ــ شاعیرانی دەقی مەقامەکانی سێوە ، لە پێداهەڵدانی هەرشتێك جوانترین‌و زیندووترین چەشن‌و ئەندامیان هەڵبژاردووەو چاکیش لێی سەرکەوتوون .

بۆ نموونە : لە دەربڕینی جوانی ئافرەتدا کەوتوونەتە وەسف کردنی ئەو ئەندامانەی کە دەبنە پێوانەی جوانی‌و شۆخ‌و شەنگی‌ی مێینە لەبەر چاوی نێرینەی جوانی پەرستدا ، هەر لەبەژنی بڵندو سنگی سپی‌و مەمکی فنجان‌و گەردنی زەردو چاوی بەڵەکەوە بگرە تاکوو دەگاتە برژانگ‌و برۆی ڕەش‌و چاوی گەشی وەك سەقەرو باڵەبان‌و دوگمەی سینەو مەمکان‌و زی‌و کراس‌و تۆڵ‌و باونجی کچی شەنگ‌و شۆڕی کورد .

ئەمانە بوون چەند پێوانەو نیشانەیێکی رەسەنایەتی مەقامەکانی ستوەی هونەرمەندی کوردمان ، هیوادارم توانیبم تا رادەیێك ئامانجی مەبەستم بپێکم‌و خزمەتێکی بچووکی ئەدەب‌و هونەری کوردی بکەم .

**پەراوێزو سەرچاوەکانی ئەم باسە : ـ**

**١ ـ چەرخەچی : دەوریە ، زەلامێکە کە بۆ پاراستنی ئەمن‌و ئاسایش لە ئاوەدانی‌دا بسووڕێتەوە ( بنوارە : فەرهەنگی خاڵ جـ ٢ ، ل٣٥ )**

**٢ ـ شامیری : جۆرە شمشێرێکی جەوهەردار بووە ، لە میسر دروست کراوە .**

**٣ ـ هەنیی : نێوچەوان [ بروانە : فەرهەنگی مەهاباد، ل ٦٩٥ ] .**

**٤ ـ رەند : رووخۆش ، قسەخۆش**

**٥ ـ عەباسی : جۆرە دراوێکی ئێرانی بووە ، لە سەردەمی شا عەباسی صەفەوی لێ‌دراوە**

**٦ ـ سێ شایی : جۆرە دراوێکی دیکەی ئێران بووە .**

**٧ ـ بازی بەند : دووعاو نوشتەیەکە لە قۆڵ‌و بازوو دەبەسترێ .**

**٨ ـ لێرەدا مەبەستی لە یەمەن شارێکی کوردستانی تورکیا بووە کە لە رۆژهەلاتی خاکی بوتان‌بوە**

**٩ ـ زەر : سووك کراوی ( زەرد )ە ، لە سەر شێوەی بۆتان‌و بادینان گوتراوە .**

**١٠ ـ لەوکەسانە ١ ـ رۆستەم حەویزی شاعیر[کۆیە: بیستووە ١٩١٣] کە ئەویش لە باوکی ٢ـ وەستا مەولوودی حوسێن رەمەزانی بۆریچی [گوندی مێرغوزارە : ١٩٣٢ ] کە ئەویش کاتی خۆی لە کۆیخا عوسمانی دالداغانی بیستووە وئێستا ئەم وەستامەدلوودە لە هەولێر بۆریچی‌یە .**

**١١ ـ الدکتور جمیل الملائکە ، میزان البند ، بغداد ، ١٩٦٥ ، ص٤ و ص٥**

**١٢ ـ زوگرتی : پیاوی بێ ژن‌و ماڵ**

**١٣ ـ قایمە : هێزو قووەت ، قایمەڵان : جێگەو شوێنی خۆ قایم‌کردنە .**

**١٤ ـ کرتی : جۆرە دەوێنکە لە دارگەز بچووکترە**

**١٥ ـ تفەنگی شەشخان : جۆرە تفەنگێکی کۆنە ، هێزی چەکداری عوسمانای لە سەدەی رابوردوودا بەکاری دەهێناو لە کوردستان وەك چەکێکی نوێ بەکار دەهات**

**١٦ ـ باڵەبان : جۆرە باڵندەیێکی گۆشت خۆری راوکەری چاو گەورەیە [ بروانە فەرهەنگی خاڵ، جزئی یەکەم ، ل ١٠٤ ]**

**١٧ ـ حدوود : بە ئەسپ‌و ماینی رەسەنی کوردی دەگوترێ .**

**١٨ ـ قەسر : کۆشکێکی هاوینی‌یە ، بە جۆرێکی وا دروست دەکرێ ، لە هەموو لایێك هەوای فێنك بیگرێتەوە .**

**١٩ ـ سارنج : فێنکترین شوێنی کۆشکی هاوینی‌یە .**

**٢٠ ـ قۆر : قۆڵ ، بازوو .**

**٢١ ـدەخونجێن : دەگونجێن .**

**٢٢ ـ باونج : جۆرە زریزەیێکی زیوی پلپلەدارە ، لە یاخەو زارکە قۆلی کەوای ژنان دە دوورا ، ئێستا ئەو چەشنە خشلە باوی نەماوە .**

**٢٣ ـ عەلی بەگی داسنی : سەرداری عەشیرەتی داسنی کوردی یە زیدی بوو ، لە شەرێکی‌دا لەگەڵ محەمەد پاشای رەواندزی بەدیل گیراو ، لە زارکی گەلی ئەو شارە لە سێدارە درا .**

**٢٤ ـ مەتار : مەتاڵ ، قەلغان**

**٢٥ ـ لاوەند بەو سەربازە نا نیزامیە کوردانەیان دەگوت کە دەولەتی عوسمانلی لە لورستان‌و هەرێمی وەند یێکی هێنابوون بۆ پارێزگاری سنووری رۆژهەلاتی عیراف**

**٢٦ ـ قەرە ریار : قەرە ریاڵ ، جۆرە پارەیەکی عوسمانلی بوو .**

**٢٧ ـ تەتەر : قاصید ، نامەبەر ، پۆستەچی**

**٢٨ ـ بەردیل : بە مەڕی سێ ساڵان دەگوترێ [بروانە: فەرهەنگی خال جـ ١ ، ل ١٥٤ ]**

**٢٩ ـ کەحیلان : جۆرە ماینێکی رەسەنی عارەبی‌یە**

**٣٠ ـ چەمك : مەعنا ، مفهوم .**

**سێوە لەسلێمانی لە ئاهەنگی کۆمەڵی هونەرە جوانەکان مەقامەکانی لەسەر ئاوازی موسیقای ( ولیەم یوحەننا ) بە کەمانچە و مۆسیقاژەنێکی دیکە بەقانوون .**

# چۆن هیماکانی نووسینی بزماری شی کرانەوە

بەدرێژایی ڕێڕەوێکی دووڕۆژی لە خوارووی ڕۆژئاوای کۆشکی ((ئەکپاتان))ی هاوینیی کۆن ، وە لە سەر ڕێگەی کاروانیی کۆنی سەربەرەوخوار بۆ بابل ، قەلایەکی بەردینی پێلیکەیی بە بەرزی چوار هەزار پێ فووت بۆتەوە وە لە ڕووی ئەو قەلایەوە لەسەر ڕێگەی کاروانیەکان کە لە سەردەمی کۆندە پێیدا ڕەت دەبوون گوندێکی بچووك بە ناوی ( بێستوون ) هەیە ، ( داریۆش )ی پاشای فارسەکان ئەوێی هەلبژارد بۆ ئەوەی سەگوزشتەی بەسەرهاتی حوکمڕانیی خۆی لەقەد پالی بەردەکانی بنوسرێتەوە . بۆ ئەوەی هەموو ڕێبوارێك بتوانێت چاوی پێبکەوێو ببینێت ، وە هەروەها ئەو شوێنەش دوورە لەدەست تێوەردانی زەمانو دوژمن باسی پلەو پایەی داریۆش باشا بەسێ زمان نووسراوە لەسەر ڕووی ئەو بەردانەی ئەوێ بۆ ئەوەی خوێندەوار بیانخوێنێتەوە ، وە بۆ ئەو کەسانەیش کە بێبەشن لە خوێندەواری بەردەکان بە شێوەی ( ڕێلیف ) وێنەی پادشا دوژمنانی لەسەر هەلکۆلدراون ، بۆ ئەوەی لەشی دوژمن بخەنە لەرزین و لەزەبرو زەنگی پادشا زنئۆقیان بچێت .

لە سالی (٥١٦)ی پێش زایندا ئەو نووسەرانەی کە پاشا هەلیانی بژاردبوو بەسێ زمانی فارسیو ساسانیو بابلی لەسەر سیازدە ئەستونی ڕووی ئەرمو لووسی بەردی بێستوون ، دەستیان کرد بە نووسینی باسو خواسی پاشا . لەسەر پێنج ئەستوونی زمانی فارسیەکەوە پەیکەر تاشەکان دەستیان کرد بە هەلکۆلینو پەیکەرتاشینی وێنەی داریۆش بە قەبارەی ئاسایی خۆی وە لەبەردەمیەوە یازدە کەس لە شۆڕشگێڕانو بەرهە هەلستکەرانی بە دەستو پێ کۆت کراوی بە زەبوونیەوە ڕاوەستاون ئەوەی جێی سەرنجە بالای بەرهەلستیکەران لە بالاو قەبارەی پادشا نزمترو بچووکترن ) .

وولاتی ئەخمینی بەهەمان ڕێگەدا تێپەڕی کە وولاتە ڕۆژهەلاتیەکان پیایدا ڕەت بورن بەلام ئەم وێنە بەردینە کە بلندیو بەرزی لەناو چوون پارێزگاری کرد مایەوە وەك پاشماوەیەك بۆ ئەو وولاتە لەناو چووە . گەلێك ئەفسانە بۆ ئەو پاشماوە سەرنج ڕاکێشە هەلبەستراوە ، ریبوارەکان دەستیان کرد بەگێڕانەوەی چیرۆکی ئەفسانەیی .

دیۆ دۆرسی سقللی کە لە سەردەمی یۆلیۆس قەیسەردا ژیاوە گێڕاویەتەوە گوایە (سەمیر ئەمیس)ی ژنە پاشای بابل فەرمانی داوە ئەو ئەخشانە بکێشرێن وە هەر بۆیەش خەلکی بە شوێنێکی پیرۆزیان داناوە، تا ئەمڕۆی ئێستامان ژنە ئێرانیەکان لە هەموو لایەکەوە دێنو ڕووی تێ دەکەنو پارچە پەڕۆ بەلقو پۆپی ئەمامێك کە لە خوارووی بەردەکەوەیە دەبەستن بە مەبەستی پیرۆزی . گەشتکەرە ئەورووپاییەکان کە بەو شوێنەدا تێپەڕیون بەسەر سووڕمانەوە باسیان لێوە کردووەو جلەوی ئەندێشەیان بەرداوە بۆ ڕوون کردنەوەی ماناو هۆی دامەزراندنی ئەو دامەزراوە ( نصب ) وە لەو گەشتکەرانە لەچەرخی حەڤدەهەمدا ( بمبۆ ) بور وە لە چەرخی هەژدەهەمدا ( ئارنز ) بوو بەلام لە سالی ( ١٨٠٩ ) دا ( گاردان )ی گەشتکەر ووتی گوایە ئەو ئەخشەکێشراوانە دوازدە یاران ( الحواريين الاثني عشر ) دەگەیەنن . وە لە سالی ؟ ( ١٨٢٧ ) دا (بۆرتەر)ی گەشت کەر ووتی ئەو وێنەیە شەلماناسارو دیلە پیرەکانی ئیسرائیل دەگەیەنێت .

لە سالی ( ١٨٣٥ ) دا ( هینری ڕۆلنسن ) ئەفسەری لاوی ئینگلیزی تەمەن بیستو پێنج سالە نێردرا بۆ کرماشان بۆ ئەوەی کاری یارمەتیدانی حوکمڕانی ئێرانی بگرێتە ئەستۆ . ماوەیەکی زۆری بەسەردا نەچوو ڕۆلنسن دەستی کرد بە چاوگێڕانو بایەخدان بەو نوسینە بزماریانەی کە لە سەر شاخی ( ئەلوەند ) لەنزیك ئەکپاتان ( هەمەدان ) داهەن . ڕۆلنسن دەستی کرد بەپشکنینو شیکردنەوەی ئەو زمانە سەرنج ڕاکێشەرە نهێنیەو پیتە سەیرەکانی .

ڕۆلنسن لەیاداشتەکانیدا باسی ئەوە دەکات کە مامۆستایەکی ئەلەمانی بەناوی هر ( گرۆتفند ) توانیبووی هیمای ناوی چەند پاشایەکی بنەمالەی ئەخمینی کۆن شیبکاتەوە بەلام ڕۆلنسن ـ کە لە بەرێزدایە لە کرماشان ـ دەتوانێت چی بکات تا تێکستێکی ئەو پیتە ئە بجەدیانەی دەست بکەوێ کە ئەو مامۆستا ئەلەمانیە پێی گەیشتبوو

**کامبل تۆمپۆن نووسیویەتی**
**محمد ساڵەیی وەری گێڕاوە**

نۆزیبوونیەوە ، وەچۆن شوێنی ئەو نووسینانـــــە ڕانێت کەبۆ ئەو مەبەستە بەکاری هێنابوون ؟ .

ڕاستی‌یەکـەی گرۆتفنـــد ناوی هەستاسبو داریۆش‌و ئەخشاریشای لەدوو بڕگەدا دۆزیوەتەوە . گەشتکەری . دانیمارکی ( نەیبور ) کە لە ساڵـــی ١٧٦٥ ) دا لەسەر بەردی ( **برســـیپۆلیـــس )** نووسیبونیەوە توانی ناوی ( کۆرش ) بزانێت بـــەم شێوەیەش توانی سێ بەشی هیمای **ئـــەبجـەدی** بزماری فارسی‌یەکە کە لە نزیکەی چل تا پەنجا پیت پێك هاتبوون شی‌بکاتەوە .

**سەرەڕای هەوڵدانەکانی گرۆتفند ( لاسن ) لە ساڵی (١٨٣٦) دا گەیشتە شی‌کردنەوەی شـــەش هیمای تر ، هەروەها کارەکانی هەریەك لە مامۆستایان ( ڤاتیسن ) لە ساڵی ١٧٩٠ دا ، وە (مۆنتەر) لەساڵی ( ١٨٠٢ ) دا وە هەندێکی تریش کەبەشداریان کـرد لەکاری شی‌کردنەوەی ئەو هیمایانە .**

**هیچ کام لەو هەوڵدانانە نەگەیشتنە ئـــەو چالاکیە بەرزەی کە ئەو لاوە ئینگلیزیە گرتیە ئەستۆی خۆی وەتوانی هیماکان شی‌بکاتەوەو لێکیان بداتەوە بەبێ یارمەتی‌و پشتگیریەك ، سەرەڕای ئەوەی کـــە بەردی کێوی بێستوون یارمەتی ئەوەی ئەدەدا تـــا هیماکانی ئەو زمانە سەیرو سەممەرەیە شی‌بکرێتەوەو لێك بدرێتەوە وەك شی‌کردنەوەی هیماکانی زمانـــی هیرۆگلیفی لەسەر بەردی ڕەشید . ڕۆلنسن بەبێ ئاگایی ئەو ڕێگەیەی گرتە بەر کە ئەوەوپێش گروتفند گرتبوویە بەر ، دەستی کرد بە بەراوردکردنی دوو نووسینی ئەخشراو لەسەر کێوی ئەلوەند هەریـــەك لەپاڵ ئەوی تردا ، لەو بەراوردکردنـــە بۆی ڕوون بووەوە کە لێکچوونێکی تەواو لە نێوانیاندا هەیە جگە لە دوو برگەی بچووك ئەبێت لەهەندێك پیت لـــە هەردووکیاندا .**

**ڕۆلنسن گەیشتە ئەو ئاکارەی کە ئەو دوو کۆمەڵەیە دەبێت ناوی ئەو پاشایانە بن کە فەرمانی هەڵکۆڵینی ئەو نووسینانەیان داوە ، وەدووەمیش ئەگەر ئەوەی پێی گەیشتبوو ڕاست بێت ـ دەبێت ناوی یەکەم لەنووسینەکەدا ناوی باوکی ئەو پاشایە بێت کـــە فەرمانی هەڵکۆڵینی نووسین دووهەمی داوە .**

ڕۆلنـــسن سێ پاشای هەرە مەزن‌و بەناوبانگـــی مالاسی لە مێژوودا هەڵبژارد ئەوانیش بریتی بوون لە هەستاسبەو داریۆشی‌و ئەخشاریشا ، وە تیۆرە

تایبەتیەکەی خۆی لەسەر سەلماندن‌و بۆی ئاشکرا بوو کە مانای ئەوپیتانەی کەناوەکانیانی لێ پێك دێ هەر هەمان پیتن لەوانـــەی کەلەناوەکانـــی پێشـــــوو دەرکەوتوون،بەم شێوەیە توانی ئەو کۆسپ‌و تەگەرانە ببڕێت‌و بگاتە شی‌کردنەوەی ئەوگرێ کوێرەیە .

ڕۆلنـــس‌و مامۆستاکانی تر لە لێکدانەوەی مانای چەند پیتێك وەستان وەچەند ناوێك‌و چەند وولاتێکی تێکـــستەکە وەك پەرتووکێکی داخراو مانەوە. لەکۆتایی ساڵی ( ١٨٣٧ ) دا ڕۆلنـــسن توانی بەسەر کێشەی سەرکەوتن بۆ ڕووی بەردی کێوی بێســـتوون زاڵ ببێت‌و تێکستی نووسینە بزماریەکـــە بنوسێتەوە . تا ئەوکاتە تەنها وەرگێڕانی نیوەی تێکستە فارسیەکە تەواو بو بوو وەلەو ساڵەدا وەرگێڕانی دوو بڕگـــە لەکۆمەڵی یەکەمدا لەنووسینەکانی بـــەردی بێستوون گەیشتە کۆمەڵەی پاشایی ئاسیایی لە لەندن کـــە ناونیشان‌و ڕەگەزی داریۆشیان پێك دەهێنا . بەڵام ڕۆلنسن لەبەد بەختی‌دا ناچار بوو دەست بەرداری باسەکانی بێت پاش ئـــەوەی گوێزرایـــەوە بـــۆ هەڵسوڕاندنی پایەیەکی بلندتر لە ئەفغانستان .

چەند بەپەرۆشەوە بوو تاســـــاڵی ( ١٨٤٣ ) جارێکی تر گوێزرایەوە بۆ شاری ( خولەفا ) وە توانی بەردەوام بێت لەباس‌و لێکۆڵینەوەکانیدا . ڕۆلنسن بەدرێژایی ئەو ماوەیە دەستی‌کرد بە فێربوونـــی ( زەندی ) کەبەکۆنترین پیتی دەنگداری ئێرانی دێرین دەژمێردرێت . پەیڕەوکردنی ئەم زمانە لەســـەر نووسینە بزماریە فارسی‌یەکان پاڵپشتی‌ی کرد بـــۆ تەواو کردنی وەرگێڕانی نووسینە فارسی‌یەکانی قەد بەردەکانی کێوی بێستوون بۆ یەکەم جار بەتەواوەتی. بەهۆی شی‌کردنەوەی پیتەکان کە ناوە سەرەکیەکان پێك دەهێنن توانی ئـــەو نووسینانـــە وەربگێرێت وەدووەمیش گەیشـــتەدۆزینەوەی دەنگەکانـــان .



شارەزایی‌یەکەی لەزمانەکەدا ڕێ خۆشکەری بوو بۆ ڕاست کردنەوەی پیتە دەنگدارەکان‌و ڕوو بەڕوو کردنەوەیان دوای ئەوە ڕۆلنسن یاداشتەکانی خۆی دەربارەی بەردی بێستوون نووسیەوەو وەرگێڕانی تەواوی تێکستەکانی خستە دوو تۆیانەوە لەگەڵ باسکردنیان وەلە سالی ( ١٨٤٦ ) دا یاداشتەکانی بلاوکرایەوە . نابێت نکۆلی لە هەوڵ‌و کۆششەکانی زانای بەناوبانگ ( لاسن ) بکرێت چونکە یەکێکە لەو پێشرەوانەی کە لە وەرگێڕان‌و لێکدانەوەی هیماکان دەورێکی گرنگیان گێڕاوە ، بەشێوەیەکی تایبەتی شی‌کردنەوەی هیمای نووسینەکانی ( برسیبۆلیس )ی گرتە ئەستۆو گەیشتە زۆر ئەنجامی باش لەو بارەیەوە وە لە سالی ( ١٨٤٤ )دا بلاوی کردەوە .

**ڕۆلنسن بەبەشە فارسی‌یەکەی نووسینەکان قایل نەبوو لەسالی ( ١٨٤٤ ) دا بۆ یەکەم جار لەگەل دوو هاوەلی‌دا بەکێوی بێستوون‌دا هەلگژاو توانی ئەو درزەی نێوان ئەستوونە فارسی‌یەکان‌و ساسانیەکان ببڕێت‌و نووسینە ساسانیەکان بنووسێتەوە .**

**وای ئومێد دەکرد تا سالی ( ١٨٤٧ ) بتوانێت بگات بە وەرگێڕانی ئەو نووسینە بابلیەی کە لە دوو ڕووی دوو بەردی لوولەکی** گەورە **هەلکۆلدرابوون لە بەردەمی سەرووی ئەستوونی نووسینە ساسانیەکە.**

**ڕۆلنسن بەتەنها سەر نەکەوتە سەر ئەو بەردە، بەلکو منداڵێکی کوردی بەکار هێناو پیایدا هەلگژاو لەسەر بەردەکە دانیشت‌و دەستی کرد بەگواستنەوەی نووسینە بابلیە هەلکۆلدراوەکە بەپێی ڕێنمایەکانی ڕۆلنسن. وەرگێڕانە فارسی‌یەکە تەواو نەبوو بەلام بەوهۆیە توانرا تەفسیری وەرگێڕانە ساسانی‌و بابلیەکە بکرێت . چونکە وەرگێڕانە ساسانی‌یەکە لە ژێر دەستی هەنکسی‌و وستر گارد دی سۆلی‌و نۆرس تەواو کرا بەلام وەرگێڕانە بابلیەکە ئاکامی ئەو هەموو خۆماندووکردنەی ڕۆلنسن‌و وابەرت‌و فۆکس‌و تالبۆت بوو کە دەریان خست زمانی بابلی یەکێکە لەزمانە سامیەکانی لێکچوو لە عیبریەوە. بەم هۆیەشەوە توانرا چارەسەری کێشەی پیتە بزماریەکان بکرێت .**

ئەو جێ پەنجانەی کە ڕۆلنسن دایهێنان بۆ نووسینی هەلکۆلدراو لە کێوی بێستوون لە مۆزەخانەی بەریتانی دانراو ڕێزین ڕووی تێ‌کرد وە وەرگێڕانە بابلیەکە کە لەسەر ئەو جێ پەنجانە گواسترا بووەوە پێویسی بەچاك‌کردنەوە هەبوو .

بەڕوونی دەرکەوت کە وەرگێڕانی ووردی تێکستە فارسی‌و ساسانی‌و بابلیەکان پێویستی بەپێداچوونەوەی بەردی بێستوون خۆی هەیە ، لەبەر ئەم هۆیەش بوو مۆزەخانەی بەریتانی لە سالی ( ١٩٠٤ )دا بڕیاری دا کۆمەلێکی لێکۆلەرەوە بەرەو بێستوون بەڕێ بخات ، ئەم کۆمەلەیەش لەمن‌و دکتۆر کنگ پێك هاتبوو لە نیسانی ئەو سالەدا شاری مووسلمان بەجێ هێشت و بەرەو بێستوون کەوتینە ڕێ ، دوای ئەوەی گەیشتینە ئەوێ‌و چاوێکمان بە نووسینەکاندا گێڕاو بڕیارمان‌دا لەلای پشتەوە پیایدا هەلبگژێین .. شوێنێکمان دۆزیەوە کە بە نزیکایی دوو سەد پێ لەژووررووی پەیکەرەکەوە بوو ، دوو گوریسمان تابەردەمی شۆڕکردەوە . بەیەردەکەدا هەلگژاین تالیۆاری بنەچەی نووسینەکەو دوو جۆلانەمان بەو دوو گوریسەوە بەست‌و گوریسێکی تری قەویمان پێیانەوە بەست بۆ بەکارهێنانی بۆ گواستنەوە لە نێوان هەردوو جۆلانەکەدا . قۆناخی یەکەم لە کاری سەرکەوتن بریتی بوو لەدوازدە پێ‌و دەبوو خۆمان بەگژو گیاو بەردە دەر پەڕیوەکانەوە بگرتایە دوایش بە قەدپالێکی زۆر لێژ بەلای ڕاستدا بە درێژایی بەشە لووسەکەی بەردەکە دەبوو سەربکەوتینایە . دوای ئەوەی ڕێگامان خۆش‌کرد داوای یارمەتی‌ی یەکێك لە دانیشتوانی ئەوێمان کردو توانیمان چەند سنگێك لە دەستە ڕاستی نووسینە فارسیەکەوە دابکوتین ، وە بەسنگەکانەوە پلیکانەیەکی گوریسمان بەستەوە بەم جۆرە سەرکەوتن بۆ سەر بەردەکە هەموو ڕۆژێك بەو پلیکانە کارێکی ئاسان بوو .

**ڕولنسن لەنووسینێکدا کە لە سالی ( ١٨٥٣ ) دا لەمەوسووعەی ئەرکیۆلۆژیدا بلاوی کردەوە دەلێت « سەرەڕای ئەوەی کە یەکێك لەکۆمەلە زانستیە پاشماوەییەکانی فەرەنساوی چوو بۆ ئێران وتبووی هەرگیز ناتوانرێت نووسینەکانی کێوی بێستوون بنووسرێتەوە بەلام من توانیم سەربکەومە سەر بەردەکەو بگەمە ئەوشوێنەی کە نووسینەکانی لەسەر هەلکۆلدراوە . کاتێك کە لە کرماشان دەژیام پێش پازدە سال لەمەو بەر لە ئێستاکێ چالاکتر بووم ، ڕاهاتبووم ڕۆژی سێ چوار جار بەیەردەکەدا بە**

**گوریسێك یاخود بە پێپلیكانەیەك هەڵبگژێم ، بەڵكو زۆر جار بەبێ هیچ یارمەتیەك بەسەریدا هەڵدەگژام »** .

بەڵام ئەو نووسینە بابلیەی کە لە بەشی سەرووی بەردەکەوە نەخش‌کرابوو ڕۆلنسن خۆی بە تەنها نەینووسیەوە بەڵکو منداڵە کوردێکی بە کارهێنا وەك لەمەو پێش باسمان لێوە کرد بۆیە دەبینین لە نووسینەکەیدا دەڵێت « ئەوانەی بەچیاکاندا هەڵدەگژێن پێیان ڕاگەیاندم کە کەس ناتوانێت بگات بەو بەشەی کەنووسینە بابلیەکەی لەسەر نەخش‌کراوە

**لەژێر ئەستوونی پێنجەمی نووسینە فارسیەکەوە لێواریك هەیە بە درێژایی شەش پێ ، لە دوایشدا وورد وورد تەسك دەبێتەوە تا لە نزیك ئەستوونی یەکەمەوە بزر دەبێت ، وە لە سەر ڕووە لووسەکەی سێ ئەستوون بۆ نووسینە فارسیەکە هەن کە لەبلندیدا هاوتای بلندی ئەستوونە ساسانیەکانن‌وە هەروەها درزیك لە نیۆاییاندا هەیە.ڕوو بەرووی ئەم ئەستوونانە لێوارێکی کە هەیە بینیمان کە گەیشتن پێی بەهۆی ئەو گوریسانەی کە بەستمان ، شتێکی ئاسانە . بەڵام نووسینە بابلیەکە کە لەسەر بەردێکی کپ هەڵکۆڵدرا بوو نزیکەی دوازدە پێ لەسەر ئەو لێوارەوە بەرز بوو بۆیەوە ئەمەش گێرەو کێشەیەکی زۆری پێك دەهێنا ، بەڵام ئێمە توانیمان بەسەر ئەو کۆسپانەدا زاڵ ببین پاش ئەوەی بە کۆتایی ئەو جۆلانانەی کە شۆڕمان کردنەوە سەر پەیکەرەکان گوریسی ترمان بەستەوە ، لەدواییدا توانیمان سەرکەوینە سەر گوریسەکەو لەبان جۆلانەکان دانیشین‌و دەست بکەین بە نووسینەوەی‌نووسراوەکان و وێنەیان بگرین لەگەڵ پەیکەرەکاندا بەو جۆرە ئەم کارەمان نزیکەی شازدە ڕۆژی خایاند . توانیمان بەهۆی خۆ هەڵواسین بە جۆلانەوە لە نووسینە ساسانی‌یەکانەوە بگەینە نووسینە بابلیەکەو پیایدا بچینەوەو بەکامێرای دەستی بەدانیشتنەوە وێنەیان بگرین .**

دەزگای مۆزەخانەی بەریتانی پاش ئەوە دەستی کرد بەبڵاوکرنەوەی ئاکامەکانی ئەو لێکۆڵینەوانەی کە پێی هەڵسان لەگەڵ وێنەکاندا بە پەرتووکێکی تایبەتی بەناونیشانی « نووسینەکانی داریۆشی گەورە لە بێستووندا » .

ئەوەی شایانی باسە ئەو وورده کاریەی کە ڕۆلنسن پێی هەڵسابوو بۆ تۆمارکردنی ئەو نووسینانە ، جگە لە چەند هەڵەیەکی کەم نەبێت هیچ کەم‌و کوڕیەکی تێدا نەبوو ، ئەمەیش زۆر کارێکی کاریگەرە گەرئەستوونە فارسیەکان بەتەنها بگرین کە لە پازدە هەزار پیت زیاتر پێك هاتوون .

**نووسینەکانی بێستوون باسی ڕەچەڵەکی داریۆش‌و قەمبیز دەکەن کە لەپاش کورش هات ، وە باسی شۆرشی فارس دەکەن لە کاتێکدا کە قەمبیز لە شاڵاوەکەیدا دەچێت بۆ سەر میسر ، ( گۆماتا ) پەیدا دەبێ‌و دەڵێت گوایە برای قەمبیزەو داوای تەختی پاشایەتی دەکات . هەر ئەمەیش قەمبیزی ناچار کرد بگەڕێتە دواوە . لەوکاتەیدا کە گۆماتای شۆرشگێر دەستی بەسەر حوکمدا گرت داریۆش‌و لەشکرە بەهێزەکەی گەڕانەوەو جارێکی تر دەستیان بەسەر وڵاتدا گرتەوە بەڵام چەند شۆرشێکی تازە دژی سەریان هەڵدا . ( نەیدنتۆبەعل ) لە بابل پەیدا بوو و ناوی ( نەبوو خوز نەسر)ی لە خۆی نا ، وە مارسیا لە شۆشە هەڵگەڕایەوە وە فرۆرنیس لەماد شۆرشی دەست پێ‌کرد . بەڵام داریۆش توانی ئەو هەموو شۆڕشانە دەم کوت بکات‌و لەناویان بەرێت‌و سەرۆکەکانیشیان دەستگیر بکات . وێنە نەخش‌کراوەکانی سەر بەردی بێستوون ئەوە نیشان دەدات کە داریۆش پێ‌یەکی ناوەتە سەرسنگی گۆماتای شۆرشگێڕو ئەو دوای شۆرشگێڕەکانیش بە دەست‌و پێ کۆت کراوەوە بەرامبەری وەستاون کە بریتین لە ( ئەسرسیا )ی داواکاری تەختی شوشە ، وە ( نەیدنتۆ بەعل )ی داواکار بەتەختی بابل ، وە ( سترانتاخی ) داوا کار بەتەختی سارگاسیا ، وە ( هیزداتا ) کە دەیگوت گوایە برای قەمبیزە ، وە ( ئاراخا )ی داوا کاری دووەمی تەختی بابل ، وە ( فەرارا)ی داواکاری مارجیان وە دوایش ( سکۆنخا)ی داواکاری تەختی سیکیسیا .**

**************************

# لە پێناوی رۆشنبیری یەکی سەربە ئامانجەکانی شۆڕش و بنیات نانی عیراقێکی سۆشیالیستی گەشاوەدا

بە چاودێری بەڕێز لطیف نصیف جاسم وەزیری رۆشنبیری و راگەیاندن لە سەعات شەشی ئێوارەی ٢٠-٤-١٩٨٠ یەکەمین میهرەجانی رۆشنبیری کوردی لە ژێر دروشمی :

« لە پێناوی رۆشنبیری یەکی سەر بە ئامانجەکانی شۆڕش و بنیات نانی عیراقێکی گەشاوەدا » .

لە پارێزگای هەولێرو بە وتارێکی بەڕێز طە یاسین علی جێگری وەزیری رۆشنبیری و راگەیاندن لە هۆلی «ابن المستوفی» دەستی پێ کرد .

ئەمەیش دەقی ووتارەکەیە :



# دەقی وتارەکەی نوێنەری بەڕێز وەزیری ڕۆشنبیری وڕاگەیاندن

خوشکو برایانی خۆشەویست ..

شادمانو پێخۆشحالم کە لەجیاتی بەرێز وەزیری رۆشنبیریو راگەیاندن مامۆستا لطیف نصیف جاسم میهرەجانی یەکەمی رۆشنبیری کوردی دەکەمەوە کە لە هەولێر مەلبەندی ئۆتۆنۆمی ناوچەی کوردستان لەژێر دروشمی « لەپێناوی رۆشنبیری یەکی سەر بە ئامانجەکانی شۆرشی سەربەرزی ١٧ـ٣٠ی تەموزو لەپێناوی بنیاتنانی عیراقێکی سوشیالیستی گەشەکردوودا » دەکرێتەوەو شادمانم کە بەشداری ئەم دستەیەی ئەدیبو رۆشنبیرانی کورد بکەمو لەم میهرەجانەدا پێیان بگەم ، کە لە بەغداو پارێزگا جزربەجۆرەکانی ناوچەکەوە هاتوونو ئەم میهرەجانەش سازکردنی خۆپێشاندانێکی رۆشنبیری شارستانییانەیە ، هیوادارم لەو ئامانجانەی کە رەنگی بۆ رێژراوە سەرکەوتوو بێت .

**خوشکو براینە ..**

سازکردنی ئەم میهرجانە رۆشنبیری یە ، بێگومان بایەخ پێدانی حزبمان حزبی بەعسی سوشیالیستی عەرەبی کە بەوپەڕی لێهاتوویی شۆرشە گەورەکەمان سەرکردایەتی دەکاتو بایەخی سەرکردەکەیو بایەخی پێدانی سەرۆکی فەرماندە تێکۆشەر صدام حسین بەمافی رەوای نەتەوەیی گەلی کوردمان ساغ دەکاتەوە کە مافی رۆشنبیریش لایەنێکی گرنگی پێک دەهێنێ . بەیاننامەی ئادارو راگەیاندنی یاسای

ئۆتۆنۆمیو جێبەجێ کردنی برگەکانی ئەم یاسایەو دامەزراندنی هەردوو ئەنجومەنی یاسادانانو راپەڕاندنو دامەزراوەکانی تری ئۆتۆنۆمیو دانانی پارەیەکی زۆر لە نەخشەی پێنج سالەی پرۆژەکانی کشتوکالو پیشەسازیو خزمەتگوزارو رۆشنبیریو تەندروستیو پەروەردەییو زانستیدا .. . هتد و رێگا دانی گەلی کوردمان کە مافە دیموکراتییەکانی خۆی بەکاربێنێ ئەمانە ئەو بایەخ پێدانە ساغ دەکەنەوە کە پەنجەمان بۆ کێشانو کە رەسەنێتیو مەبدەئیەتی حزبمانو باری سەرنجە سۆسیالیستیو مرۆڤپەروەری یەکەی بەرامبەر بە نەتەوەکانی تر ساغ دەکەنەوە .

وەزارەتەکەمان وەزارەتی رۆشنبیریو راگەیاندن کە لە جوستو چالاک کردنی بزووتنەوەی رۆشنبیریو هونەری لە ولاتەکەمانو بۆ دروست کردنی نەوەیەکی رۆشنبیری هوشیارو چەکدار بەچەکی زانستو رۆشنبیریو زانینو لەپێناوی پەرەپێدانی دۆخی رۆشنبیریمان بۆ ئاستێکی شارستانیانە لەرێگای دامەزراوە رۆشنبیریو رۆژنامەنووسیو هونەری یەکانەوە ، بەشداری یەکی



نەرەتی‌یانە دەکات ... بایەخێکی زۆری داوە بەرۆشنبیری کوردی‌و جوست‌و چالاك‌كردنی بزوتنەوەکەی‌و یارمەتی‌دانی ئەدیب‌و نووسەرو رۆشنبیرانی کورد بەگشتی بەرێگا جۆربەجۆرە مادی‌و مەعنەوی‌یەکان ، دەزگای رۆشنبیری‌و بلاوکردنەوەی کوردی شان‌بەشانی دامەزراوەکانی تری رۆشنبیری‌و پەروەردەیی‌و خوێندن ، دامەزراوێکە لەو دامەزراوە گرنگانەی سەر بە وەزارەتەکەمان کە بایەخ بەم چالاکی‌یانە دەدات‌و چەند گۆڤارو رۆژنامەیەك بەزمانی کوردی دەردەکات سەرەڕای چاپ‌کردنی کتێب‌و چاپەمەنی لە بوارە جۆربەجۆرەکانی زانین‌دا .

لەپێناوی ئەوەدا کە ئەم دەزگایە بتوانێ بەپێی پێویست ئەرکی سەرشانی رابپەڕێنی وەزارەتەکەمان بایەخێکی زۆری پێدەدات حا لەبارەی دانانی ئەو پارەیەوە بێ کە ئیش‌وکارەکانی پێویستیان پێ‌یەتی لەگەل یارمەتی‌دانی بەرێگاو توانا جۆربەجۆرەکان بۆ ئەوەی ببێتە دەزگایەکی بەرەسەندووی رۆشنبیری کە ئەرك‌و خزمەتە رۆشنبیری‌و رۆژنامەنووسی‌یەکانی بۆ گەلی کوردمان بەباشترین شێوەو لەچوارچێوەی گشتی رێبەرەوی حزبمان‌و شۆرشەکەماندا جێ‌بەجێ‌یان بکات .

**************

## خوشك‌و براینە ..

ئەو شۆرشەی کە هەمیشەو بێ‌پسانەوە بەخشش پێشکەش بە رۆلەکانی گەلەکەمان رۆشنبیرو ئەدیب‌و زاناکانی دەکات‌و هەموو ئەو دۆخانەی پێویستی دابین‌دەکات‌و بەرێگای جۆربەجۆر بۆ تەقاندنەوەی وزەو توانایان‌و دەرخستنی داهێنان‌و تواناکانیان‌و ئەم شۆرشە وا لەرۆلەکانی چاوەڕوان دەکات کە لە ئاستی ئۆبالی سەرشانیاندا بن‌و بەدلسۆزی‌یەوە داکۆکی لەو دەسکەوتانە بکەن کە بۆیانی وەدی‌هێناون‌و چاوەڕێی ئەوەیان لێ‌ناکات کە تەنیا لەگەلی بن بەلکو پێویستە دلسۆزانە تێکەلی‌بن‌و لە بزوتنەوەو بەردەوامی‌یەکەی ئیلهام‌و سروش وەرگرن‌و داکۆکی لە دەسکەوتەکانی بکەن دزی دوژمنانی گەلەکەمان کە ئیمپریالیزم‌و نۆکەرانیانی .

## خوشك‌و براینە ..

لەکۆتایی ئەم وتارە کورتەمدا هیوادارم کە میهرەجانەکەتان سەرکەوتوو بێ بەو پێیەی کە خزمەتی ئەو ئامانجانە بکات کە رەنگیان بۆ رێژراوەو هیوادارم کە هەموو بەشداربووان تێیدا سەرکەوتوو بن پێش بکەون‌و ... خواتان لەگەل .



# وتەی دەزگای رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی

ئەمەیش دەقی ووتارەکەی بەرێز بەڕێوەبەری گشتیی دەزگای رۆشنبیریو بلاوکردنەوەی کوردی مامۆستا ( اسماعیل رسول )ە کە لە ئاهەنگی کردنەوەی میهرەجانەکەدا خوێندیەوە :

دانیشتوانی بەرێز

**بەرێزان بەشدارانی ئاهەنگ**

بەدڵ بەخێرهاتنتان دەکەمو سوپاستان دەکەم بۆ بەشداریکردنتان لە ئاهەنگی بەکەم ڤیستڤالی کوردیدا کە لەژێر دروشمی «لەپێناوی رۆشنبیرییەکی سەر بەشۆرشی ١٧ـ٣٠ تەمموزی سەرفرازو بنیاتنانی عیراقێکی گەشاوەدا » سازکراوە .

**خوشکان برایان**

دەزگای رۆشنبیریو بلاوکردنەوەی کوردی ، ئەم دەزگای راگەیاندنو رۆشنبیرییە کوردیە گرنگەی سەر بە وەزارەتی رۆشنبیریو راگەیاندن بەچاودێری بەرێز وەزیری رۆشنبیریو راگەیاندن مامۆستا لطیف نصیف جاسم یەکەم ڤستڤالی کوردی پێك دەهێنێت کە بەسوپاسەوە هەموو یارمەتیو پێویستییەکی پێشکەش کردووین بۆ سەرکەوتنی ڤیستڤالەکەمان کە لە هەولێری مەلبەندی ئوتۆنومیدا ساز دەکرێت .

پێك‌هێنانی ئەم ڤیسڤالە بەشێکە لەو نەخشەیەی دەزگاکەمان بۆ گورجکردنەوەی بزووتنەوەی رۆشنبیریو ئەدەبی دایناوە ئەویش بەهێنانەکایەی هەلی ئەو تۆوە کە ئەدیبو رۆشنبیران هەلگرانی مشخەلی رۆشنبیری و زانستو روناکی تیایدا بەیەك بگەن .

ئەم ڤیستڤالەمان بریتییە لە پێك‌هێنانی کۆڕی شیعرو چیرۆكو تۆژینەوەو لێکۆلینەوەی جۆربەجۆر ، کەبەسەر رۆژانی ڤیستڤالەکەدا بەگوێرەی پرۆگرامێکی نەخشەکێشراو دابەش کراوە، کە شاعیرانو ئەدیبانو مامۆستا بەرێزەکان بەشداری تیادا دەکەن .

**دانیشتوانی بەرێز ..**

ئێوەی بەرێز ئاگادارن لەوەی دەزگای رۆشنبیریو بلاوکردنەوەی کوردی ماوەی چەند سالێکە دەورێکی گرنگ لە ژیانی رۆشنبیرو ئەدەبیدا دەگێرێت ، هەر ئەوە رۆژنامەی «هاوکاری »ی هەفتانەو گۆڤاری « رۆشنبیری نوێ »و «بەیان» دەر دەکات .

ئەو چاپەمەنیانە شیلەی بیرکردنەوەو هۆشو فکری مێشکی رۆشنبیرانمان دەڕێژنە توێی لاپەڕەکانی نووسەرانمان بەچالاکیەوە بۆ

دەولەمەندکردنو پەرەپێدانی رۆشنبیریی کوردی لەرێگای بە هەمەکانیانەوە بەشداری تیادا دەکەن ، ئەوەتا رۆژنامەی « هاوکاری » تاکە رۆژنامەیەکە لەمێژووی کوردیدا بۆ ماوەی پتر لە دە سال بەبێ راوەستان بەپلەیەکی پێشکەوتوو چ لە بارەی دەرهێنانی هونەریەوە وەیا لەبارەی ناوەرۆکی بابەتەکانیەوە دەردەچێت ، رۆژنامەکە ،

رۆژنامەیەکی گشتیە بایەخ بەهەموو بەشەکانی گەلی کورد دەداتو هیچ دەستەو توێژێکی کۆمەلایەتی پشتگوێ ناخات . هەر لە هەوالی جیهانیو ناوخۆ و راپورتو شیکردنەوەی سیاسییەوە تا وەکو ختنەرووی دەستکەوتەکانی شۆرش لە هەموو مەیدانو کۆرێکدا بەتایبەتی دەستکەوتەکانی شۆرش لە ناوچەی ئۆتۆنۆمیدا ، سەرەرای ئەو لاپەرانەی بۆ ئەدەبو هونەرو ئافرەتو لاوانو زانستو وەرزشو لێکۆلینەوەو ریپۆرتاژو هەمەرەنگو شتیتر تەرخان کراوە .

دەزگاکە هەولی داوە بۆ ئەوەی لەسەر پرۆگرامێك نەخشەیەکی رۆشنبیریی بۆ سەرجەمی نیشتەجیالاکیکانی خۆی دابنێت وە لە چوارچێوەی ئەم نەخشەیەدا چاپەمەنێکانی هەر یەکەیان بۆ مەبەستێك تایبەتی کات ، بۆ نموونە گۆڤاری بەیان بۆتە گۆڤارێکی ئەدەبی تایبەتی بەبلاوکردنەوەی چیرۆكو شیعرو کەلەپورو لێکۆلینەوەی رەخنەی ئەدەبیەوە ، وە « رۆشنبیری نوێ »یش رێبازێکی تازەی بۆ دانراوە

نە ببێتە گۆڤارێکی رۆشنبیریی گشتیو لێکۆلینەوە دەربارەی هەموو جۆرە لقێکی زانیاری مرۆڤایەتی وەك مێژوو ، زمانو فەلسەفەو تەبابەتو باری کۆمەلایەتیو پەروەردەو زانستی دەرون شوناسیو هونەرو ئابووری بلاو بکاتەوە ، وە ئامانجیش لەوەدا دەولەمەند کردنی رۆشنبیریی کوردیە بەجۆرە ناوەرۆکێکی نوێی ئەوتۆ کە جێگای ئاسۆگری هەمە جۆری زانستی تیادا بێتەوە سەرەرای ئەوەی بتوانی خواستی ئەو تاقمە رۆشنبیرانە وەدی بهێنێت کە ئەدیب نین .

هەروەك دەزگاکە هەولی داوە هەروەك بەردەوام هەول دەدات بۆ ئەوەی هەموو ئەدیبو رۆشنبیران لەدەوری خۆی گرد بکاتەوە بۆ ئەوەی ببێتە مەلبەندێکی رۆشنبیریی گرنگی ئەو تۆ کە کارێکی تەواو بکاتە سەرباری رۆشنبیری بەرەو پێشکەوتنو بەرەسەندنێکی تەواوی بەرێت ، رۆژنامەو گۆڤارەکانمان هەر بەوەوە راینەوەستاوە کە لاپەرەکانی بۆ هەموو قەلەمێکی خێرخوا بکاتەوە کە حەز بەزانستیو روناکی دەکاتو مەشخەلەکانی برایەتیو خۆشەویستی یەکێتیی نیشتمانی بلند دەکەنەوە بەلکو هەروەها هەولی داوە کە باوەش بۆ بەرهەمی ئەدیبو نووسەرە کوردەکان بکاتەوەو ئەو بەرهەمانەیان بەگوێرەی توانا لەسەر ئەرکی خۆیان بارمەتیدانیان چاپ بکات ، شانبەشانی دەزگاکانیتری رۆشنبیریی کە ئەوانیش ئەم ئەرکەیان هەلگرتووە ، بەلام دەبێت ئەوە بلێم کە گەیشتن بەخواستی ئێمەو خواستی



برایانی ئەدیبو روشنبیران
بەندە بەوەوە کە بەگشتی‌ی
چەندە لە کاری رۆشنبیریدا
هاوبەشی دەکەن ، وە
هاوبەشیان لەوەدا کە ببنە
سەرچاوەیەکی لە بن
نەهاتووی کەرەسەی
رۆشنبیری‌و ئەدەبی کە
چاپەمەنیەکانی ئێمە پشتیان
پێ دەبەستێت . .

**دانیشتوانی بەرێز . . .**

عێراقی خۆشەویستمان
لەبەرپابوونی شۆرشی حەفدەی
تەمموزی سەرفرازەوە
بەسەرکردایەتی حزبی بەعسی
سۆشیالیستی عەرەبی ،
راپەرینێکی زانستی‌و
رۆشنبیریی ئەوتۆی بەخۆیەوە
دیوە کە لە مێژووی

هاوچەرخدا شتی وا رووی
نەداوە ، وە بنچینەی ئەو
راپەرینەش خولقاندنی
پێویستی‌یە کانێتی ، لە
ئامادەکردنی کادیری زانستی‌و
رۆشنبیری لە هەموو پلەیەکدا،
لەگەڵ ئەو فراوانیە گەورەیەی

خوێندن لە هەموو قۆناغەکانی
سەرەتایی‌و ئامادەیی‌و پلەی
زانکۆو خوێندنی بەرزدا تیا
روداوە ، ئەوە بوو ژمارەیەکی
زۆر زانکۆو ئامۆژگای زانستی‌و

هونەری کرایەوە ، سەرەڕای
قوتابی بۆ دەرەوە ناردن ،
دەزگای جۆر بەجۆر هەیە

ئەرکی ئەم کارە گەورەو
فراوانەی گرتۆتە ئەستۆ ، وە
بەڵگەی ئەم راپەرینە
لەپشتنمانە بەخوێندنی
مەجانی‌و بەزۆر پێ خوێندن‌و

دەستکردن بەهەرەوزی
فراوانی قەلاچۆکردنی
نەخوێندەواری‌و قوتابخانە
میللیەکانە ، قسەکردن لەم
بوارەدا جێگای لەم چەند

دێرە کەمەی ئەم وتە کورتەدا
نابێتەوە ، بەڵام دەبێت ئەوە
دەستنیشان بکەم کە ئەم
بابەخدانە لەمەیدانی
بلاوکردنەوەی خوێندن‌و

روشنبیریدا ناوچەی
کوردەواریشی بەجۆرێک
گرتۆتەوە کە لەمەو بەر
شتی وا نەبینراوە ، ئەمڕو لە
تەك دەزگاکەی خۆماندا
دەبینین ، دەزگاو دایەرەی
رەسمی تر هەن کە ئەرکی

کاری فێرکردن‌و رۆشنبیریی
هەلگرتووە ، وە چالاکانە
هاوبەشی دەکات لە
پێشخستنی رۆشنبیری‌و
ئەدەبی کوردیدا و گۆفارو
چاپەمەنی‌و کتێب لە هەموو

لق‌و پسپۆریەکدا بلاو
دەکاتەوە وەك زانکۆی
سلیمانی‌و ئەمینداریتی
گشتی‌ی رۆشنبیری‌و لاوان‌و
کولیجی ئەدەبیات بەشی

کوردی‌و کۆڕی زانیاری
عێراقی ـ دەستەی کوردی‌و
بەڕێوەبەرایەتی گشتی‌ی
خوێندنی کوردی ، سەرەڕای
یەکێتی‌ی نووسەرانی کوردو

کۆمەڵەی رۆشنبیری کوردی
و دەزگای گەشت‌و گوزارو
نیقابەی هونەرمەندان لقی
هەولێرو سلیمانی بەڵام
لەراستیدا ئەرکی گەورە

کەوتۆتە سەر دەزگاکەی ئێمەو
ئەو هەموو ئەرکەکانی
کەوتۆتە ئەستۆ .

**زۆربەتەنگ ئەوەوە دەهاتین**
**کە هەموو ئەدیب‌و نووسەرە**
**کوردەکان لەم فیستڤالەدا**
**بەشداری بکەن وە لەپێناوی**
**ئەوەدا لە هەموو رێگایەکەوە**
**داوای ئەوەمان لێ کردن کە**
**لێکۆلینەوەو توێژینەوەو**
**شیعرەکانیان پێشکەش بکەن،**
**بەو پێیەی کە فیستڤالەکە**
**لەبەر ئەوان پێك دێت‌و ئەوان**
**کۆلەکەی گەورەی کارەکەن**
**جا بەو جۆرە ئەو**
**هەلسەنگاندنەی لەدواییدا**
**دەکرێت‌و ئەو حوکمەی لەبارەی**
**رادەی سەرکەوتووی**
**فیستیڤاڵ‌و پلەی گۆڕە**
**رۆشنبیریکان بەچاکی‌و خراپی**
**دەدرێت بەتەنیا هەر بەر**
**دەزگاکەی ئێمە ناکەوێت بەڵکو**
**بەر هەموو ئەدیب‌و**
**دەکەوێت کە بەشدارن**
**لەلیژنەی بەرزی راپەراندندا**
**و بەر هەموو ئەدیبت‌و**
**نووسەرانی کورد دەکەوێت .**

ئێمە پێشەکی سوپاسی هەموو بەشداران و هاوبەشی کەرانی ئەم ڤیستڤالە دەکەین وە سوپاسمان بۆ

هەموو ئەدیب و نووسەرو رۆشنبیرانی کوردە وە ئەوانەش کە توێژینەوەو لێکۆلینەوەو چیرۆك و شیعریان

پێشکەش کردووە جا ئەگەر لە کۆڕەکاندا پێشکەش کرابن وەیا بەهۆی نەبوونی کاتەوە پێشکەش نەکرابن ، هەروەك

بەتایبەتی سوپاسمان پێشکەشی سەرۆکایەتی زانکۆی سلیمانی و عەمادەتی کۆلیجی ئەدەبیات دەکەین

بۆ ئەو هاوکاری و بەشداری یە بەسوودەی لەم ڤیستڤالەدا کردیان بەوەی ژمارەیەك لە مامۆستا

بەڕێزەکانی توێژینەوەو لێکۆلینەوەی بەنرخیان پێشکەش کردووە سەرەڕای ئەوەی تیپی زانکو گەلێ

چالاکی هونەری پێشکەش کردووەو لەگەڵ بەشداری کردنیان لەپێشانگای کتێبی کوردیدا .

**سوپاسی سەرۆکایەتی ئەنجومەنی راپەراندنی ناوچەی کوردستان و هەموو برایانی کاربەدەست لە ناوچەکەدا ، وە سوپاسی هەموو برایانی**

لەناوبردنی نەخوێندەواری، لەناوبردنی هەژاری و نەزانین و نەخۆشیدا

* * * * * * * * * * * *

**فەرمانبەران و ئەو کەسانەی ر دەکەین کەبەشداریان کردووە یا بەشداری دەکەن**

**لە هەلگرتنی ئەرکی ریکخستن و بەڕێوەبردنی ئەم ڤیستڤالەدا .**

وە لە کۆتاییدا لە کانگای دڵمەوە سڵاو لە هەمووان دەکەم و هیوادارم کە هەمووان

کامەران بن بەرۆژانی ڤستڤالەکەو بەشداری کردنی کاریگەرو بەسوودیان. لەگەڵ سڵاو ڕێزمدا .

**اسماعیل رسول احمد**

**سەرۆکی لیژنەی بەرزی راپەراندنی ڤیستڤاڵ**

**بەڕێوەبەری گشتی ی دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی**



# چالاکی یەکانی یەکەمین میهرەجانی رۆشنبیری کوردی

لە ئاهەنگی کردنەوەی ئەم میهرەجانەدا بەرێز عبداللە اسماعیل وەزیری دەولەتو ژمارەیەك لە بەرێزان ئەمینداره گشتی یەکانی ناوچەی ئۆتۆنۆمی و بەرێز پارێزگاری هەولێرو بەرێز سکرتێری لقی هەولێری حزبی بەعسی سوشیالیستی عەرەبو ژمارەیەکی تر لە کاربەدەستانی دەولەتو میوانان کە لە بەغداو شارەکانی تری کوردستانەوە هاتبوون لە میهرەجانەکەدا ئامادە ببوون .

هەروەها لە کردنەوەی میهرەجانەکەدا چەند چالاکی یەکی هونەریی پێشکەش کرا کە ماوەی دوو سەعاتیان خایاندو تێیاندا چەندە گۆرانی یەکی هەمە چەشنەی کوردی لە لایەن تیپی زانکۆنی سلێمانیی و چالاکی قوتابخانەکانی هەولێرەوە پێشکەش کران چەند بروسکەیەکی سلاوو پیرۆزباییش خوێنرانەوە کە لەم لایەنانەوە هاتبوون : کۆمەلی هونەرو وێژەی کوردی لە هەولێر . هەردوو لقی یەکێتی نووسەرانی کورد لە هەولێرو سلێمانی .نیقابەی هونەرمەندان لە تیپی نەتەوەیی لقی هەولێر .

رۆژی ٢٢-٤ و لە هۆلی ابن المستوفیدا دوکتور جمال رشید لە ژێر ناونیشانی « بنەرەتی وشەی کوردو کرمانجی » باسێکی گرنگی خوێندەوەو لە سەرەتادا کاك سامی شورش دوکتور جمالی بە خەلکەکە ناساند . ئنجا کاك ممتاز حیدری دەربارەی رۆژنامەنووسی کورد کاك

مصطفی شوقی وتارێکـــی گرنگـــی خوێنـــدەوە .
سەر لە ئێوارەی هەمـــان ڕۆژ چوار چیرۆکی کـــوردی خوێندرایەوە کە کاك محمـــد موکری چیروکەکانـــی هەلسەنگاندن‌و بیروڕای خۆی لە بارەیانەوە پێشکەش کرد .

لەو لێکۆلینەوانەی کـــە لە میهرەجانەکەدا خوێندرانەوە ئەو باسە بوو کە کاك محمـــد امین هەورامانی لــــە ڕۆژی چوارەمی میهرەجانەکەدا لـــە ژێر ناونیشانی « نـــەورۆز .. ئاگرو بەهار »دا خوێندیـــەوە، ئنجا لە دەرهێنانـــی کـــاك صباح عبدالرحمن تیپـــی نواندنی هەولێر شانۆگەریـــی « هەبو نەبووی » پێشکەشـــ کرد .

وە لە کۆڕێکی شـــیعر خوێندنەوەدا ئەم شاعیرانـــە سەرو پارچە شـــیعریـــان خوێندەوە :

- داری ساری حیدر .
- مؤید طیب .
- محمد امین پێنجوینی .
- عبدالله عباس .
- محسن ئاوارە .
- محمد امین قەرەداخی .

سەرلەبەیانیش مامۆســـتا اسماعیل رسول لەهۆلـــی ڕوشنبیری جەماوەریـــی لەهەولێر پێشانگای کتێبـــی کـــوردی کردەوە . . لەپێشانگاکەدا ئەو کتێبـــە کوردی‌یانە نیشان‌دران کـــە دەزگای ڕۆشنبیری کـــوردی‌و دەزگاکانی تر چاپیان کردوون.

● دکتور کامل بصیر عەمیدی کۆلیجی ئەدەبیاتی زانکـــۆی سلێمانی لێکۆلینەوەیەکـــی ئەدەبـــی لەمیهرەجانـــەکەدا پێشکەش‌کرد کە لەژێـــر ناونیشانی«لاسایی‌و ڕەسەنی‌ی لەرەخنەسازی کوردیـــدا » بوو .. دوای ئەمە بەرێـــز دوکتور کوردستان موکریانـــی لەژێر ناونیشانی « دەنگـــی ئافرەتی کورد لــــە هونراوەکانیدا » پێش‌کەشـــ کرد ئەمیش گەلێـــك لایەنی ژیانی ئافرەتی کوردی رون‌کردبۆوەو چەنـــد نموونەیەکـــی شـــیعری هێنابۆوە . بۆ خۆشکردنـــی میهرەجانەکەش تیپـــی هونەری میللـی بەســـرە ئاهەنگێکی هونەریی پێشکەشـــ کرد .

● لەچـــوارەمین ڕۆژی میهرەجاندا بەرێز دکتـــور شوکریە رەسول لـەژێـــر ناونیشانی « ڕۆلی فۆلکلۆری کـــوردی لـــەرووداوی مێژوویدا » باسێکـــی گرنگی‌پێشکەش کـــردو لەباسەکەیدا تیشکی خستـــە سەر سامانی فۆلکلـــۆری گۆرانی کوردی‌و چەنـــد نموونەیەکی سەرکەوتوانـــەی بۆ ئەم بابەتە هێنایـــەوەو لەدواییدا ئامادەبـووەکان ڕای خۆیان لەسەر باسەکـــە دەربڕی .

سەر لەئێوارەش کۆڕێکـی شیعر خوێندنەوە ســـاز کرا کە ئەم شاعیرانـــە سەرو پارچە شیعریان تێـــدا خوێندەوە :-

- مدحت بێخەو .
- نافع عقراوی .
- حسیب قەرەداخـی .
- خورشیدە بابان .
- محفوظ مایی .
- عثمان شەیدا .
- مکرم رشید .
- خلیل دهۆکی .
- سلام محمد .
- نەوزاد رفعت .
- د. شۆ .

هەر لـــە ڕۆژی ٢٤-٤ داو بۆ دەرکردنی ماندو جارسی‌ی بەشداربووان گەشتێك بـــۆ هاوینەهەواری شەقـــلاوە سازکراو کاتێکـــی خۆشـــ لەگەشتەکەدا برایە سەر .



# ووتاری بەڕێوەبەری گشتی لەکۆتایی یەکەمین میهرەجانی رۆشنبیری ی کوردی دا .

**ڕۆژی ٢٥-٤-١٩٨٠ کاتژمێر ٩ی سەرلەبەیانی لە هۆلی ( ابن المستوفی ) دانیشتنێك بۆ خوێندنەوەی باسەکەی مامۆستا تیلی ئەمین پێکهێنرا ، کە بە ناونیشانی ( بشتکرتنی چینی چەوساوە لە شیعری کوردیدا ) بوو ، کە د. نافع ئاکرەیی پێشکەشی کرد ، پاش ئەوە بەڕێز اسماعیل رسول ووتارێکی خوێندەوە ،ئەمەیش دەقی ووتارەکەیە :ـ**

برایانی خۆشەویست برایانی . . . نووسەرو ئەدیب وئەدەب دۆستان بە ناوەی خۆم و دەزگای ڕۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی .. بە ناری گشت کارگەرانی ئەم دەزگایە ، گەرمترین سلاوو قورلترین هەستی خۆشەویستی برایەتی و دۆستایەتیتان پێشکەش دەکەم، سوپاسی بەشداربوونتان ئەم میهرەجانەدا دەکەم ، هەرچەندە میهرەجانەکە هی خۆتانە .

**برایان**

وەکوو دەیزانین ئەرکی سازدانی ئەم میهرەجانەو بارە قورسەکەی بە زۆری کەوتە سەر شانی دەزگاکەی ئێمە ، بەلام من هەرگیزو بەردەوام لەم باوەڕەدام کە بەبێ یارمەتی ی ئێوە ، لە وانامانەدا نەبوو هیچ شتێك بهێنینە کایە ، ئێوەی ئەدیب و ڕۆشنبیر ،بێ گومان کەرەستەی هەموو جوولانەوەیەکی ڕۆشنبیرین ، بەبێ ڕووناکبیرو ڕۆشنبیرو ئەدیب و نووسەر ، لە تواناداا نی یە ، هیچ جۆرە جوولانەوەیەکی ڕۆشنبیری پەیدا بێ و گەشە بسێنێ. جگە لەوەیش نامەوێت ئەرکی لایەنانی تر کە هەر یەکە بەپێی توانای خۆی لەم میهرەجانەدا ، بەشداری ی کرد ، پشت گوێ بخەم و لێتان بشارمەوە .

دەبێ بلێم یەکێتی ی نووسەرانی کورد بە گشت لنەکانی یەوە ، مەردانە هاتنە مەیدان ، زۆربەی زۆری بەشدارانی میهرەجان ئەندامی ئەم یەکێتی یەن ، زۆربەی ئەو لیژنانەی کە بە کاری هەلسەنگاندنی ووتارو شیعرو چیرۆك هەلسان کە لەم میهرەجانەدا خوێندرانەوە، ئەندامی ئەم یەکێتی یەن ، من خۆم و گەلێك کارگەرو کارگێرانی دەزگاکەمان ئەندامی ئەم یەکێتی یەن .

دەبێ بلێم زانکۆی سلێمانی و مامۆستاکانی بەشی کوردی ی کۆلێجی ئەدەبیات چالاکانە لەم میهرەجانەدا بەشداری یان کرد، ئەم باسانەی دکتۆر کامل بصیرو دکتۆرە کوردستان موکریانی و دکتۆر جمال رشیدو دکتۆرە شکریە رسوول ، کە لە کۆڕەکانی میهرەجاندا پێشکەشیان کردو خوێندیانەوە جێ ی شانازین، ئەمەیش وا ناگەیەنێت کە باسەکانی تر جێ ی ڕەزامەندیم نین ، بەلکوو مامۆستاکانی تریش بەو باسانەی لە کۆڕەکاندا خوێندیانەوە،دیسان جێ ی شانازی ی ئێمەن و دەبێ بە چاوێکی پڕ لە ڕەزامەندی و بە هەستێکی پڕ لە خۆشەویستی و ڕێزلێنانەوە سەیریان بکەین و ناویان بهێنین .

بەلام تۆزێك گلەییم لە شاعیرەکان هەیە .. لەوانەی بەشداربوون و لەوانەی تری کە بە گەلێك بیانوو خۆیان دەربازکرد . ئەمەیش گلەیی دۆستێکە نەك ناحەزێك، جارێ با بێمە سەر ئەوانە کە بەشداری یان کرد . بێگومان ئێمە سوپاسیان دەکەین ، بۆ بەشداربوونیان ، چونکی بوون بە هۆی ڕازاندنەوەی میهرەجانەکە ، .. میهرەجان بەبێ شیعر خوێندنەوە ،زۆر زەحمەتە پێ ی بلێیت میهرەجان ، .. بەلام دەبێ شیعر هەر بۆ شین و گریان و فیغان و واوەیلا بێت .. ؟!! دەبێ شاعیر بە ڕەشبینی سەیری کاتی خۆی و رووداوی وولاتەکەی بکات ؟ ئایا هیچ شتێك نی یە ، پێیدا هەلبلێین و بۆی بێ بکەنین و ناخی دلمانی پێ ڕووناك بکەینەوە ؟ ئاسۆ بۆ هەر سوور بێت ، دەبێت چاو لە شنەبەقی شین و سەوزی ئاسۆ وەربگێڕین .. ؟! ئەمە پرسیارێکەو بەس .

با بێینە سەر ئەوانەی بەشداریان نەکرد .. لێیانـ دەپرسم بۆ .. لەبەر چی ؟! من بەش بە حالی خۆم داوام لە زۆربەی زۆریان کرد .. ئەوانەی ناسراوو ناودارن و

چەندین ساڵە بە شاعیر دادەندرێن بۆ ئەوەی گلەییمان لێنەکەنو توانجمان لێ نەگرنو نەڵێن ئەوانەی بەشدارییان کرد ، نیمچە شاعیر بوونو شیعرەکانیان بێبەهرەو بێتامو بۆ بوون . هەر یەکە بە بیانوویەك خۆی دەربازکرد ، ئەوەی گوتی هیچ شتی تازەم نییە بۆ میهرەجان دەست بدات . . هەتا دوایی .

من بۆیە ئەم گلەیە دەکەم ، چونکی زۆر بە ئەستەمو گرانی دەزانم لە بەشداربوونیان ، ، لەبەر ئەوەی زۆربەیان دۆستو ناسراومن ، بە گوێلێبوونی دەنگی رەسەنیان دەگەشامەوە ، زۆریش پیم ناخۆش بوو جێگایان بەتاڵ بێت . بەڵام چیم لە دەست دێت هەر ئەوەم بە دەستە سوپاسیان بکەمو ئومێدەواری بەشداربوونی میهرەجانێکی نربانلی بکەم .

لەوانەیە قسەم زۆر بێت ، ئەوەیش دەزانم ئێوەی خۆشەویست ماندوون ، حەقی خۆشتانە ئەگەر بە پەلەی گەڕانەوە بن ، بێگومان ئەو چەند ڕۆژانەی رابوردوو ماندووی کردنو لە حەسانەوەی خستن . لەبەر ئەوە نامەوێت ئەوەی لە دەروونماندایە هەمووی بە یەکجار دەربهێنم ، حەزیش بە سەرێشەتان ناکەم ، بەڵام ئەوە دەڵێم ، کە ئەم میهرەجانەی سازدراو ئێستا خەریکی ئەوەین کۆتایی پێبهێنین ، شتێکی زۆر جوانو پیرۆز بوو ، بۆ جووڵانەوەی ئەدەبیو ڕۆشنبیری . دەستکەوتێکی زۆر گرنگ بوو ئەگەریش هەر کەمو کورتییەك لە بەڕێوەبردنیدا رووی دابێت ، لە گرنگیو سەرکەوتوویی کەم ناکاتەوە ، دەبێت ئەوەیش بزانین ، کە یەکەم میهرەجانەو یەکەم تەجرەبەیە ، ئومێدەوارم ، هەر هەڵەیەكو هەر کەمو کورتییەك رووی دابێت ، ببێت بە دەرسێك بۆ سازدانی میهرەجانانی دواڕۆژ .

لەوانەیە هەندێك برادەر گلەییان هەبێتو ، هەندێك شت بە دڵیان نەبووبێت ، ئێمە دەڵێین حەقی ئەوانە ، دواوای لێبوردنیان لێدەکەین ، دەبێت خۆیان بە خاوەنماڵ برایان

که چاو دەگێرم ، جێی هەندێك لە دۆستو برادەرانی نووسەرو ئەدیبان بە بەتاڵی دەبینم ، داخێکی زۆر بە گوڕ لە دڵمدا وا جۆش دەدات ، لەبەر ئەوەی دەرفەتی بەشداریکردنی میهرەجانەکەیان چنگنەکەوت ، بەڵام هەر وەك خۆمو لەگەڵ شادومانیم بە دیدەنتان لێرە ، هەرگیز هەستم بە خەمباریی دیارنەبوونیان دەکرد ، لەو باوەڕەشدام ، هەتا ئەوانەی بە ئەنقەستیش نەهاتبن لە ناخی دڵیانەوە بیرو هەستیان دەگەڵ ئێوەو میهرەجانەکەدا بووە . دەی دونیا دوورو درێژە رۆژی ئەوەیش دێت لە میهرەجانێکی ترو کۆڕێکی

تردا ، بە دیدەنییان شادومان بین .

برایان

ئێمە وەنەبێ لەم ئاستە بچەقینو پشتی خۆمان نکەینەوە ، بڵێین ئای ماندوو بووینو میهرەجانمان سازداو بەسە ؟! نەخێر دەبێت بڵێین ئەمە سەرەتای جووڵانەوەی ڕۆشنبیریمانە . ئێمە ئامانجو ئاواتێکی زۆر فراوانمان لەبەر چاوە ، دەبێت هەموومان ئامادەبین .. بە ئاواتی ئەوەین کۆڕێکی فراوان لە شاری سلێمانی ببەستین ، دوکتور جمال رشید بەڵێنی ئامادەکردنی باسێکی مێژوویی پێداوین ئومێدەوارین پسپۆڕانی تریش بەشداریی تێدابکەن . ئەگەر بێتو ئەدیبانی بادینانی هیمەتێك بکەن ئێمە ئامادەین کۆڕێکیش لەوێ ببەستین ، دیسان بە ئومێدی ئەوەین کۆڕێکی تایبەتی بۆ زمانو زمانەوانیو گیروگرفتەکانی لە بەغدا ببەستین ، ئومێدەوارین پسپۆڕانی زمان بەشداریی تێدا بکەن .

بەڵێنی ئەوەشتان پێدەدەم ، کە ئەم باسو وتارو هۆنراوەو چیرۆکەکانی ئەم میهرەجانە بە قەشەنگی لە چاپ بدرێن ، ژمارە یەکی تایبەتیی ڕۆشنبیریو بەیان ، بەم بۆنەیە دەربچن ، دەگەڵ نامیکەیەکی تایبەتی بە چالاکییەکانی میهرەجان بخرێتە ئەرشیفو بڵاوبکرێتەوە .

لە کۆتایی دوانەکەمدا ، هەر ئەوەم بۆ ماوەتەوە کە بڵێم چالاکیی ئێمە ڕەنگدانەوەی چالاکیی ئێوەیە .. چالاکیی دەزگاکەمان بۆ ئێوەو بۆ گەلی کوردە . ئێستر بە خواتان ئەسپێرم .

**براتان**

**اسماعیل رسول**

# بەیاننامەی کۆتایی یەکەمین میهرەجانی رۆشنبیری کوردی

لەژێر چاودێری بەڕێز وەزیری ڕۆشنبیریو ڕاگەیاندندا لە ماوەی نێوان ٢٠–٢٦ی نیسانی ١٩٨٠ یەکەمین میهرەجانی ڕۆشنبیری کوردی لەژێر دروشمی ( لەپێناوی رۆشنبیری‌یەکی سەر بە ئامانجەکانی شۆڕشو بنیاتنانی عیراقێکی سۆشیالیستی گەشاوە )دا لە هەولێر بەستراو بەڕێز طه یاسین وەکیلی وەزارەتەکە لە جیاتی وەزیری بەڕێز بە ووتارێك کردیەوە تیایدا پێشوازی‌ی لە ئامادەبووان کردو ئاواتو هیوای سەرکەوتنی بۆ بەشداربووان خواست بە چەشنێك خزمەتی ئەرکە نەخشە بۆ کێشراوەکانی میهرەجان بکات هەروەها تیایدا رووني کردەوە کە سازکردنی ئەم میهرەجانە خۆی لە خۆیدا رەنگدانەوەی بایەخدانی سەرکردایەتی‌ی حزبو شۆڕشو بایەخدانی سەرۆکی فەرماندە تێکۆشەر ( صدام حسین )ە بە مافە نەتەوەیی‌یە ڕەواکانی گەلی کوردمان کە مافە ڕۆشنبیری‌یەکان لایەنی گرنگیان پێکدەهێنێت .

هەروەها ڕۆلی وەزارەتی ڕۆشنبیریو ڕاگەیاندنو دامو دەزگا جۆراوجۆرەکانی لە گوڕ خستنە بزووتنەوەی رۆشنبیریو هونەری لە وولاتدا روونکردەوە بۆ خولقاندنی نەوەیەکی رۆشنبیری هۆشیاری بە زانستو رۆشنبیریو زانیاری چەکدار . پاشان ئەو بەڕێز اسماعیل رسول احمد بەڕێوەبەری گشتی‌ی دەزگای ڕۆشنبیریو بڵاوکردنەوەی کوردی ، سەرۆکی لیژنەی بالای ئامادەکردنی میهرەجان ووتارێکی خوێندەوە تیایدا بە خێرهاتنی ئامادەبووانی کردو بە دوورو درێژی باسی ئەو ڕەنجانەی کرد کە لە لایەن دەزگای ڕۆشنبیریو بڵاوکردنەوەی کوردی‌یەوە بە هاریکاری لەگەل دامو دەزگا رۆشنبیری‌یەکانی تردا دراون بۆ ئامادەکردنو سازدانی ئەم میهرەجانە ، هەروەها باسی سیاسەتی دەزگاکەی کرد کە مەبەستی گوڕ خستنە نیو بزووتنەوەی ئەدەبیو رۆشنبیری‌ی کوردی‌یەوەو گرد کردنەوەی نووسەرانو رۆشنبیرانو هاندانیان بۆ ئەوەی بەشداری‌یەکی کاریگەرانە لەم بزووتنەوەدا بکەن هەروەها ستایشی ئەو دەستکەوتە مەزنانەی کرد کە سەرکردایەتی‌ی حزبو شۆڕش لە بوارەکانی ڕۆشنبیریو پەروەردەو زانستدا بەدی‌ی هێناونو خولقاندنی پێداویستی‌یەکانی ڕابەرینێکی زانستی‌ی ڕۆشنبیری‌ی ئەوتۆ لە مێژووی هاوچەرخماندا وێنەی لەوەوێش نەبووبێت .

لە ئاهەنگی کردنەوەدا کە لە کاتژمێری شەشی سەر لە ئێوارەی رۆژی یەك شەممەی ڕێکەوتی ٢٠–٤–١٩٨٠ لە هۆلی ابن المستوفی‌دا بوو ، ئەم وەزیرە بەڕێزانە عبداللە

اسماعیلو هاشم حسن عتراویو سەرۆکی ئەنجومەنی ڕاپەڕاندنی ناوچەی کوردستان بەڕێز احمد عبدالقادر النقشبندیو سەرۆکی ئەنجومەنی یاسادانان بەڕێز محمد علیو بەڕێز ئەمینداری نهێنیی لقی حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیستو بەڕێزان ئەمیندارە گشتی‌یەکانو بەڕێز پارێزگاری

هەولێرو بەڕێز جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی یاسادانانو ژمارەیەکی زۆری بەرپرساوە بەڕێزەکانو نوێنەرانی حزبە نیشتمانی‌یە کوردە بەشدارەکانی بەرەی نیشتمانیو نەتەوەیی پێشکەوتنخوازو نوێنەرانی ڕێکخراوە میللیو پیشەیی‌یەکان ئامادە بوون . سەرەڕای

بەشداربووانو بەشداری - کەرانی میهرەجانەکە لە نووسەرو ئەدیبو ڕۆشنبیرە کوردەکانی تر . ئەوەبوو میهرەجانەکە چالاکیی ڕۆشنبیریو ئەدەبیو هونەریی هەمە چەشنەی تێدا نوێنرا ، بەسەر ڕۆژانی میهرەجانەکەدا دابەش‌کرابوون، لە دانیشتنی بەیانیانو سەر لە ئێوارانی بەردەوامدا .

ئەوەبوو کۆڕەکانی سەر لە بەیانیان بۆ خوێندنەوەی باسو لێکۆڵینەوە جۆراوجۆرە ئەدەبیو ڕۆشنبیری‌یەکان تەرخانکرابوون کە مامۆستایان دکتۆر کامل حسن البصیر عەمیدی کۆلێجی ئەدەبیاتی زانکۆی سلێمانیو دکتۆرە کوردستان موکریانیو دکتۆر جمال رشیدو دکتۆرە شکریە رسولو مامۆستایان ممتاز حیدریو محمد امین هەورامانیو عبداللە قەرەداغی و تیلی امین بەشداری‌یان تێداکرد . کۆڕەکانی ئێوارانیش بۆ خوێندنەوەی شیعرو چیرۆك تەرخانکرابوون ئەم شاعیرانە بەشداری‌یان تێداکرد :

**١ - حسیب قەرەداغی .**
**٢ - عبدالرحمن مزوری .**
**٣ - داری ساری حیدر .**
**٤ - مؤید طیب .**
**٥ - محمد امین پێنجوێنی.**
**٦ - عبداللە عباس .**
**٧ - محسن ئاوارە .**
**٨ - سەرفراز علی .**
**٩ - محمد امین کاردۆخی.**
**١٠ - مدحت بێخەو .**
**١١ - دکتۆر نافع ئاکرەیی.**
**١٢ - عثمان شەیدا .**
**١٣ - خورشیدە بابان .**
**١٤ - خلیل دهۆکی .**
**٥ - نوزاد رفعت .**
**١٦ - مکرم رشید تالەبانی.**
**١٧ - سلام محمد .**
**١٨ - محفوظ مائی .**
**١٩ - احمد شکری .**

هەروەها ئەم چیرۆکنووسانە بەشداری‌یان تێدا کرد :

**١ - احمد محمد اسماعیل.**
**٢ - ابراهیم سلمان .**
**٣ - رؤوف حسن .**
**٤ - غفور صالح .**

ئەوەبوو چیرۆکنووس محمد موکری ئەو وتارە ڕەخنەگری‌یەی خوێندەوە کە دەربارەی هەڵسەنگاندنو ڕەخنەلێگرتنی ئەم چیرۆکانەی نووسیبوو .

**٥ - محمد نوری توفیق .**
**٦ - شیرین کمال .**
**٧ - عبداللە عزیز خالد.**
**٨ - انور محمد طاهر .**
**٩ - محمد فریق حسن .**
**١٠ - جزا علی امین .**

ئەمەو لە ڕۆژانی میهرەجانەکەدا چالاکیی هونەریی هەمە چەشنەی مۆسیقاو گۆرانیو هەڵپەڕکێی میللیو شانۆگەری نوێنران ، تیایدا تیپی مۆسیقای زانکۆی سلێمانیو تیپی چالاکیی قوتابخانەکانی پەروەردەی پارێزگای هەولێرو تیپی بەڕێوەبەرێتیی ڕۆشنبیریی جەماوەر لە پارێزگای سلێمانیو ، هەندێك هونەرمەندانی هەولێرو سلێمانی بەشداربوون هەروەها تیپی هونەرە میللی‌یەکانی بەسرە ئاهەنگێکی هونەریی میللیی پێشکەش‌کرد تیایدا نموونەیەکی نایابی مۆسیقاو سەمای میلیی نواند ، سەرەڕای بەشداربوونی تیپی هەولێر بۆ نواندنی سەر بە دەزگای سینەماو شانۆ بە شانۆگەریی (هەبوو نەبوو )و تیپی کۆمەڵەی هونەرو وێژەی کوردی لقی هەولێر بە شانۆگەریی ( ئەو پیاوەی بوو بە سەگ ) ئەوە بوو ئەم چالاکی‌یە میللی‌یانە ڕەزامەندیو پەسەندکردنی بەشداربووانو جەماوەریان بەدەستهێنا ، سەرەڕای ئەوەی پێشانگایەك بۆ کتێبی کوردی لە هۆڵی ڕۆشنبیریی جەماوەر دا پێکهێنرا تیایدا ئەو کتێبو چاپەمەنی‌یانە پیشاندران کە بەر لە دە ساڵ تاکو ئەمڕۆ لە لایەن دامو دەزگا ڕۆشنبیری‌یە کوردی‌یەکانەوە دەرچوون ، میهرەجانەکە خۆپیشاندانێکی ڕۆشنبیری‌یانەی گەورە بوو بە ڕاستگۆیانە خواستو

ناوانی جەماوەری ئەدیبو رۆشنبیرانی کوردی دەربڕی ئەوانەی لە پارێزگاکانی دیکەوە هابوون بۆ ئەوەی تیایدا بەشدار بن‌و بەشداری ـ کردنێکی ڕاستەقینەی چالاك‌کردنی بزووتنەوەی رۆشنبیری‌و ئەدەبی بکەن ئەویش بە هۆی ئەو کۆڕو چاوپێکەوتنانەی پەنجەمان بۆ ڕاکێشان .

لە لایەکی تریشەوە سەرلەنوێ سووربوونی شۆڕش‌و سەرکردایەتی‌یە تێکۆشەرەکەی دووپات‌کردەوە بۆ پشت‌گرتن‌و هاندانی رۆشنبیری‌ی کوردی بە هەموو حزرە شێوازێك‌و لەباوەش‌گرتنی نووسەران‌و رۆشنبیران بەوەی کە بەهەڵگری فیکری رووناك دادەنرێن‌و کاریگەرترین چەکیان بە دەستەوەیەو لە رووی ئیستیعمارو کۆنەپەرستان‌و زایۆنیزمدا بەرزی دەکەنەوەو لە توانایاندا هەیە بە بیرو پێنووسەکانیان بەشداری‌ی مانەوەی کۆمەڵی نوێ‌و چەسپاندن‌و پتەو کردنی یەکێتی‌ی نیشتمانی‌ی گەلی عیراقمان بکەن . بەشداربووانی ئەم میهرەجانە ڕێزێکی بەرز لەو ڕەنجانە دەنێن کە دەزگای رۆشنبیری‌و بلاوکردنەوەی کوردی‌ی سەر بە وەزارەتی رۆشنبیری‌و ڕاگەیاندن لە پێناوی سازاندنی‌دا بەم جۆرە سەرکەوتووە داویەتی هەروەها ڕێزێکی بەرز لەو پشتگیری‌یە مەزنە دەنێن کە بەڕێز وەزیری رۆشنبیری‌و ڕاگەیاندن مامۆستا لطیف نصیف جاسم پێشکەشی کردو ئەو تواناو پێداویستی‌یانەی ئامادەی کردن کە لە هۆیە بنەڕەتیەکانی سەرخستنی میهرەجانەکە بوون هەروەها ڕێز لە ڕەنجی هەموو لایەنەکانی تر لە دەستەو دام‌و دەزگاو دایەرە رۆشنبیری‌و ڕاگەیاندنی‌یەکان دەنێن‌و سوپاسگوزاری‌و ڕێز ئاراستەی هەردوو سەرۆکی ئەنجوومەنی ڕاپەڕاندن‌و یاسادانان‌و بەڕێز پارێزگاری هەولێرو لقی هەولێری حزبی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست دەکەن بۆ ئەو یارمەتی‌دان‌و پشتگیری‌یانەی بۆ سەرخستنی میهرەجانەکە پێشکەشیان کرد.

بەشداربووانی ئەم میهرەجانە پێخۆشحاڵی‌ی خۆیان بۆ ئەو سەرکەوتنە دەردەبڕن کە میهرەجانەکە بە دەستی هێنا ئەگەر لە چەشنی توێژینەوەو لێکۆڵینەوە بەنرخەکان‌دا بووە کە تیایدا پێشکەش کران . چونکە بەشداری‌کردنێکی ڕاستەقینەی دەوڵەمەندکردنی رۆشنبیری‌ی کوردی پێك‌دەهێنن چی لە بەشداری کردنی ئەدیبان‌و نووسەران‌دا بێت چی لە ڕەنجی رۆشنبیرە کوردەکان‌دا بێت یان لەو چالاکی‌یە هونەری‌یانەی تیایدا پێشکەش‌کران . ئەوان لە کاتێك‌دا ڕۆژە خۆشەکانیان بەسەرێ‌دەکەن چاو لە دەبڕن کە سازدانی ئەم میهرەجانە ببێتە تەقلیدێك هەڵبقوڵێت‌و ئەرکێك ، نەك هەر تەنیا دەزگای رۆشنبیری‌و بلاوکردنەوەی کوردی جێبەجێ‌ی بکات بەڵکوو دەمەو دام‌و دەزگا رۆشنبیری‌یە کوردی‌یەکانی ترو پەیوەندی‌یان بە کاروباری ئەدەب‌و رۆشنبیری‌یەوە هەیە سالی جارێك سازی بدەن یان دەوری بێت بۆ ئەوەی توانایەکی فراوان تری بۆ تەرخان‌بکرێت . بەشداربووانی ئەم میهرەجانە ئەو بڕوایەیانەوە کە رۆشنبیری چەکێکی کاریگەرو گرنگە لە تێکۆشان‌دا دژی ئیمپریالیەت‌و زایۆنیزم‌و ڕەگەزپەرستی‌و ئەوان دەنگیان دەدەنە پاڵ هەموو دەنگە بەشەرەفەکان کە دژی زایۆنی‌ی تاوانبار تێ‌دەکۆشن کە هێشتا بەشێکی بەنرخی نیشتمانی عەرەب ( فەلەستین )ی داگیرکردووە ، جارێکی دیکە ئەوە دووپات دەکەنەوە کە لە گەڵ تێکۆشانی نەتەوەی عەرەبدان لەپێناوی ڕزگارکردنی فەلەستین‌و وەدەست‌هێنانەوەی تەواوەتی‌ی مافە ڕەواکانی، گەلەکەی هەروەها بە توندو تیژی پیلانەکانی کامپ دیڤیدو سیاسەتی خۆبەدەستەوەدەرانەی سادات تاوانبار دەکەن کە بە پیلانێکی گەورە دادەنرێت نەك تەنیا دژی گەلی عەرەبی فەلەستین بەڵکوو دژی خەباتی هەموو نەتەوەی عەرەب . بەشداربووانی ئەم میهرەجانە بە توندی ناڕەزایی خۆیان دەربارەی ئەو کارە تاوانکاری‌یانە دەردەبڕن کە تاقمە بەکرێ‌گیراوەکان لەم دوایی‌ەدا ئەنجامیان‌دان ، لەگەڵ ئەو ئیجراءاتانەشدان کە شۆڕش بۆ لێدانی دەستی ئەوانە بەکاری هێناون‌و ، هەروەها دیسان بە توندی

نارەزایی خۆیان دەربارەی کارەکانی ئەلقە لەگوێکانی خومەینی دەردەبڕن کە چنگیان ناوەتە بینەقاقەی گەلەکانی ئێران و پیلانە نارەواکانیان دژی گەلی عیراقی تێکۆشەرمان و پشتگیریی خەباتی گەلانی ئێران دەکەن لە پێناوی ڕماندنی ئەم حوکمە ڕەگەزپەرستانەدا هەروەها لەگەڵ خەباتی گەلی کوردماندان لە ئێران و لەگەڵ خەباتی گەلی عەرەبدان لە عەرەبستان و لەگەڵ خەباتی هەموو نەتەوەکانی تردان بۆ ئەوەی مافە نەتەوەییە ڕەواکانی خۆیانیان هەبێت لە چوارچێوەی ئەوانەیش دا ئۆتۆنۆمی هەروەها بەتوندو تیژی هێرشی دەمکوت کردن و تۆرۆریستی و قەلەپاچەکردن تاوانبار دەکەن کە بەم نەتەوەیانە دەکرێن کە داوای مافە ڕەواکانی خۆیان دەکەن.

لە کۆتاییدا بەشداربوان چاو لەوە دەبڕن ڕەنجی هەموو دام و دەزگا ڕۆشنبیرییەکان و ڕەنجی هەموو ئەوانەی لە ناوەندی ئەدەبی و ڕۆشنبیریی کوردیدا کاردەکەن یەك بگرێت بۆ ئەوەی میهرەجانە ڕۆشنبیرییەکانی داهاتوو پتر فراوان و گۆڕانکارییان تێدا بێت و بەشداری کردنی هەموو لە گوڕ خستنە نێو بزووتنەوەی ئەدەبی و ڕۆشنبیرییەوە بەو جۆرەی خزمەتی خواست و ئاوات بکات ، پتر پەرەبسێنێت.

**بەشداربووانی یەکەمین میهرەجانی ڕۆشنبیریی کوردی لە هەولێر**

# بەڕێز سەرۆکی فەرماندە

# لە یەکەم فیستڤاڵی ڕۆشنبیری کوردییەوە بروسکەیەکی سوپاسنامەی پێ دەگات

ئێمە بەشدارانی یەکەم فیستڤالی کوردین کە لە هەولێر لە ماوەی ٢٠-٢٦-١٩٨٠دا لە ژێر دروشمی لە پێناوی ڕۆشنبیرییەکی سەربە ئامانجەکانی ١٧-٣٠ی تەممووزدا گیراو .. سوپاس و ستایشی بێ پایانی خۆمان بەرامبەر جەنابی بەڕێزتان و سەرکردایەتی حزب و شۆرش دەردەبڕین بۆ ئەو چاودێری و بایەخدانەی بە مافی گەلی کوردمانی دەدەن کە مافی ڕۆشنبیریی بەردی بناغەکەی پێك دەهێنێت ، وە ئەم ڤیستڤاڵەمان بەلگەیەکی ئاشکرایە بۆ ئەو چاودێرییەی لە ڕۆشنبیریی کوردی دەکرێت ، وە بە گشتیی بۆ هەموو ئەدەب و ڕۆشنبیرانی کورد .

ئێمە لە کاتێکدا ئەوە رادەگەیەنین کە لە ڕیزی شۆرشداین لەو کارانەیدا کە بۆ لێدانی دەستی تاوانباران بە دڵنیایی هاوولاتیان دەیانوێنێت ئەو پەڕی نارەزایی خۆمان بەرامبەر پیلانەکانی ڕژێمی ڕەگەزپەرستی فارس و دەست تێوەردانی لە کاروباری ناوخۆی وڵاتمان نیشان دەدەین وە بە توندی نارەزایی خۆمان بەرامبەر ئەو تۆقان و سەرکوت کردنە خوێناویە نیشان دەدەین کە ئەو ڕژێمە دژی گەلانی ئێران و گەلی کوردمان لە ئێراندا دەینوێنێت ، کە لەگەڵ نەتەوەکانی تردا تێدەکوشێت لە پێناوی مافی نەتەوایەتی ڕەوای خۆیاندا .

داوای سەرکەوتنتان بۆ دەکەین لە پێناوی خۆشی گەل و گەشەکردنیدا . هەر بژین .

**بەشدارانی یەکەم ڤیستڤاڵی ڕۆشنبیریی کوردی**

وەزارەتی رۆشنبیری و راگەیاندن
یوسف متی

## مقدمة ومختارات

ئامادەکردن و پێشکەش کردنی

سلیم عبد القادر

تازە کەوتووەتـــە بازاڕەوە

هەلبژاردەی چیرۆکەکانی یوسف متی لەگەڵ شی‌کردنەوەو رەخنەگرتن لـــە هەنـــدێك لـــە هۆنراوەکانی .

دابەش کردنی
دەزگای نیشتمانی‌ی دابەش‌کردن و بڵاوکردنەوە بەغدا

---

وەزارەتی رۆشنبیری و راگەیاندن

## ثورة ١٤ تموز ١٩٥٨ في العراق

لیث عبد الحسن جواد

دانـــاوە

لێکۆڵینەوەیەکە پەیڕەوی شـــی‌کردنەوەی زانستی دەکات کە لەسەر بناغەی پیشاندانی رووداوە مێژوویی‌یەکان و راستـــی لـــێ‌دەرهێنانیـــان و شی‌کردنەوەیان بەپێی ئایدۆلۆژیەتێکی زانـــستی‌ی شۆڕشگێرانە ، دامەزراوە

دابەش کردنی

دەزگای نیشتمانی‌ی دابەش‌کردن و بڵاوکردنەوە بەغدا

## بورن

له ژمــــاره ۷۹ی گۆڤاری رۆشنبیری نوێدا ، وتارێك به ناوی یادی دووسەد ساڵەی ئەو شارەی بۆ ئێمە دەژی که کاك صباح غالب نووسیبوی ، لەگەل وتارێکی تر به ناوی ســرودی شــــادمـــانی وەك نامیلکەیەك بۆ منداڵان که کاك ابوبکر قەرەداغی بۆ مــــانی تاردبو ، له کاتی چاپکردندا به هەڵه ناویان نەنووسرابو وه هەروه ها له جیاتی ناوی کاك رشید احمد فتاح له وتاری ( رۆژ ) دا بەهەڵه محمــــد رشید فتاح نووسراوه . بۆیه له هــــەموان تکـای بوردن ئەکەین .

رۆشنبیری نوێ

---



---

# ئافرەتو بەرزەمنا

نووسینی : د. نوال السعداوی
ئەبوو بەکر قەرەداغی کردوویە بە کوردی



راستی‌یە زانستی‌یەکان بە ئەنجام داوە کە مرۆڤ چ نێربێ یا مێ ئەقلی هەیەو بیر ئەکاتەوە ، وە هەروەها تواناى زهنی هەیە کە ئەمەیان بە گوێرەی ئەو بارو زروفە کۆمەلایەتی‌و ئابووری‌و دەرونی‌و پەروەردەیی‌یەی تیا ئەژی زیادو کەم ئەکاو ، ئەو جیاوازی‌یە نی‌یە ، ئەو ئەزانی‌یەی لە پیاوێکی کۆیلەدا دەردەکەوێت هیچ کەمتر نی‌یە لەو ئەزانی‌یەی کە لە ئافرەتێکی کۆیلەدا دەردەکەوێت . وە لێرەدا بەرەو رووی نوێترین زانیاری بایۆلۆجی دەبیەوە کە ئەلێ : « مۆخی مرۆڤ لە سەرەتای دروست بوونی کۆرپەلەی لە منداڵانا مێینە دەبێ ، مۆخی پیاویش لە بنچینەدا هەر مۆخی مێینەیە ، دوایی لەپڕ بەهۆی هۆرمۆنی نێرینەوە پرۆسێی نێرینەی تیا ڕوو دەدات ، هەمان شتیش بە نیسبەت کۆرپەلە هەموو یەوە ڕاستە کە لە بنچینەدا لە مێینەوە هاتووەو جووت ڕەگەز نی‌یە وەکو لەمەوپێش لە کۆرپەلە زانیدا زانرابوو . هەتا ئەمڕۆ بۆ هیچ یەکێ لە زاناکان ناڵوێ کە بلێ لە ڕاستی مۆخی مرۆڤ یان فرمانە بالاکانی‌و ناوەندەکانی گەیشتووین ، چونکە تائێستاش ئەم مۆخە کۆسپێکی سەختە لە ڕێگەی زانستو پزشکی‌دا ، ئەم مۆخە هەتا ئێستاش نهێنی‌یەکی داخراوەو لە چەند شتێکی کەم بەولاوە هیچی لێ نەزانراوە .

شوێنی دەروون ، مۆخە ، هەتا ئێستاش تێگەیشتنی مرۆڤ لە دەروونی هیچ زیاتر نی‌یە لە ئەقلی ، گەرچی ئەم دابەش کردنەی مرۆڤ بۆ لەش‌و ئەقل‌و دەروون لە دابەش‌کردنێکی بیردۆزی بەولاوە زیاتر نی‌یە لە پێناوی لێکۆلینەوەو تایبەتی‌یەکی ووردا کە ئەمان گەیەنی بەزانیاری‌یەکی زۆرترو ڕوون تر ، بەلام ئەم تایبەتی‌یە وورده وەکو شیرێکی دوو سەر وایە ، کە هەندێ تەفسیلاتی تەواو ڕوون دەکاتەوە بەلام مانا تەواوە گەورەکە وون دەکات‌و ، مرۆڤ پارچە دەکا بۆ ئەو زانیاری‌یە جیاوازانەی کە تا زانست پێش بکەوێ‌و تایبەتێتی زیاتر بێت ، ماوەی نێوانیان زیاتر دەبێ .

ئەم پارچە کردن‌و جیاواز کردنەوەیەی نێوان زانستەکانیش ڕەنگە ببێتە هۆی بێ ئاگایی‌یەکی زیاتر لە مرۆڤ ، کە پیاو هەمیشە ئەوەی لە بیر نەبێ کە مرۆڤ یەکێتی‌یەکی تەواوەو پارچە پارچە ناکرێ .

یەکێتی مرۆڤ «وەکوگیانە وەرێکی کۆمەلایەتی» لە لەش‌و دەروون « ئەقڵ »و کۆمەڵ پێك هاتووە ، لەبەر ئەمە بیردۆزی زانستی تەواو دەربارەی مرۆڤ ناتوانێ کاری کۆمەڵ لەسەر مرۆڤ فەرامۆش بکات، وەکو چۆن ناتوانێ لەش‌و ئەقڵ‌و دەروونی لێ فەرامۆش بکات ، چونکە ئەمانە یەکن‌و جیابوونەوەیان

بۆنی‌یه .

ئەو لێکۆڵەرەوەیەی « لە هەچ زانستێك لە زانستەکانی مرۆڤایەتیدا » لە باسەکەیدا کۆمەڵ لە بیر بکات ، وەکو ئەو کەسەی لێ‌دێ کە لە پڕێکا بەسەر دوورگەی ئەو کۆیلانەدا دێتە خوارەوە ، کە لە لایەن گەورە مەمالیکەکانەوە خەسانلرابوون ؛ کاتێ فەحسیان ئەکاو گون نابینێ هاوار دەکات : « هەموو کۆیلەکان بێ گون لە دایك ئەبن‌و وا تەسەور ئەکا کە ئەمە سروشتی کۆیلەکانە » .

بۆ هیچ یەکێك نالوێ کە بلێ ئەو لێکۆڵەرەوەیە کەوتۆتە هەڵەوە کاتێ تێبینی نەبوونی گونی لەناو ئەو کۆیلانەدا کردووە ، تێبینی‌یەکانی ڕاست‌و حەقیقیشن بەڵام ئەوەی لەم تێبینی‌یەوە هەڵیهێنجاوە هەڵەیە ، هەڵبەت هۆکەشی هەر بۆ ئەوە ئەگەڕێتەوە کە « لێکۆڵەرەوەکە » ئاگاداری ئەو جەورە نەبووە کە لە لایەن ئاغاکانەوە لە کۆیلەکان کراوە .

ئەوەی فرۆیدیش بەسەر ئافرەتیا هێنا ، هەروەك کاری ئەو لێکۆڵەرەوەیە وابوو ، فرۆید ئەوەی ڕەچاو کرد کە ژن « لە دەوروبەری فرۆیدا » ئەو زیرەکی‌و توانا زهنی‌یانە دەرناخەن کە پیاو بەگشتی هەیانە ، وەهەروەها ژن کەمتر لە پیاو بایەخ بە کاروبارە گشتی‌یەکانی ژیان ئەدەن .

لە وانەیە فرۆید لەو ڕەچاو کردنەیدا ڕاست‌بێ، سەبارەت بەو ئافرەتانەی کە لەو کۆمەڵەداو لەو کاتەدا ژیاون ، بەڵام ئەو هەڵەیەی فرۆیدی تێکەوتووە لەوەدایە کە تەفسیری ئەم دیاردەیە وەکو هەمان دیاردەی نەمانی گونی کۆیلەکان دەکات . وە ئەڵێ « ئافرەت بە سروشتە تایبەتی‌یەکەی خۆی لەو بارە زهنی‌یانەدا لە پیاو کەمترە ، بەرزەمنی ( Supergo ) ئافرەت لە بەرزەمنی پیاو بێ‌هێزترە ، وەپرسیاریان لێ‌کرد بۆچی بەرزەمنی ئافرەت لەبەر زەمنی پیاو بێ‌هێزترە ، ئەو ووتی چونکە کچێکی بچکۆلە گرێی ئۆدیبەکەی خەفەناکات ، بۆچی کچێکی بچکۆلە کە گرێی ئۆدیبەکەی خەفە ناکات ؟ ئەو ووتی چونکە چۆتە قۆناغی ئۆدیبەوە دوای ئەوەی ڕاستی بوونی خۆی تێ دەگا کە خەسێنراوە ، « بەهۆی نەبوونی ئەندامی نێرینە لە لەشیدا » ..

لەمەوە هیچ هەستی بە ترس نەکردووە کە پالی پێوەبنێ بۆ خەفەکردنی گرێی ئۆدیبەکەی‌و لە دروست بوونی بەرزە منیشدا . وە زۆر لە زانایانی

نر « ئەندامانی بیردۆزی شیکردنەوەی دەروونی » لەگەڵ شیکردنەوە کەی فرۆیدا یەك دەگرنەوەو ئەمەو ئەوەیان هەڵهێنجاوە کە بەرزەمنی ئافرەت لە دروست بوونیا بێ‌هێزە ، وە لەمەوە ویژدانی ژن لە ویژدانی پیاو بێ‌هێزترە ، وەهەروەها باوەڕە فیکری‌و مەبدەئی‌یەکانیشیان بێ‌هێزترێکە، لەبەر ئەوە هەمیشە ئافرەت مەیلی بە ڕاگۆڕیندا هەیەو هاوڕەئی مێردەکەیەتی یان هاوڕەئی هەر پیاوێکی تر دەبێ کە لە ژیانیدا پشتی پێ دەبەستێ .

ئەم بیروڕایانە چەند دوورن لە زانستەوە کاتێ بەو جۆرە دوور لەو زروفی کۆمەڵایەتی‌یەوە دەردەکرێت کە پاڵ بە ئافرەتەوە ئەنێ کە بە مێردەکەیەوە بگرسێتەوەو هاوڕایەتی بکات . تا ئەو کەسەی لە دەست نەچێ کە بەخێوی ئەکات « واتا مێردەکەی » چونکە کۆمەڵ کارێکی نەداوە تێ پێی بژی شووکردن نەبێ .

هەروەها فرۆید : « سەبارەت بە توانا زهنی‌یەکانی ئافرەت » ئەڵێ : ـ

« ئافرەت توانا ذهنی‌یەکەی زووتر لە پیاو وون دەکات ، وەئەڵێ : کاتێ ئافرەت ئەگاتە تەمەنی سی‌ی سالی توانا ذهنی‌یەکەی لە پەرەسەندن ئەکشێتەوە ، کەچی ئەم تەمەنە لای پیاو بە سەرەتای گەشەسەندنی ئەقلی دائەنرێ . وە فرۆید هەولی داوە کە تەفسیری ئەمە لە ئەندامی سێکسی ئافرەتدا یان پێشکەوتنی سێکسی ئافرەتدا بدۆزێتەوە ، بەڵام هیچ شتێکی زانستی دەست نەکەوت کە پشتی پێ ببەستێ بۆیە ئەڵێ : « ئەم پرۆسیسە لەوە ئەچێ لە بەرەو پێش‌چوون بەرەو دوا ڕۆژ وەستابێ ، وەوا دیارە کە ئەو ڕێگە درێژە سەختەی مێینەیەتی پیایا دەگوزرێ هەموو تواناکاری ئافرەت لە ناو دەبات .

لە ڕاستیدا ئەوەی لێ‌هاتوویی ئافرەت لەناو دەبات و توانا ذهنی‌یەکەی لە گەشەی سروشتی دەوەستێنێ، ڕێگە درێژە سەختەکەی فرۆید نی‌یە ، بەڵکو ڕێگەی کۆمەڵ‌و خێزان‌و ئەو یاسایانەیە کە ڕێ لە فێربوونی ئافرەت ئەگرێ ، یان ڕێ لە فێربوونی بەردەوامی ئەگرێ‌و هەروەها ڕێ لە گەشە سەندنی توانا ذهنی‌یەکەی ئەگرێ بە هۆی بەندکردنی لە ماڵەوە وخزمەت کردنی پیاوو منداڵەکانی‌و ڕێ نەدانی بۆ ئیش کردن‌و دەور گێڕان لە چالاکی‌یە گشتی‌یەکاندا .

سەرکەوتنی ئافرەت لە کۆمەڵدا بەوە پێوانە

**دەکرێ کە تاچ ڕادەیەك لە شتنی قاپو قاچاخو چنینی گۆرەوی‌و چێشت کردن‌و هێشتنەوەی مێردەکەیدا سەرکەوتووە . سەرکەوتنی فیکری‌و زیرەکی ئافرەت ئەمانە هەمووی بە لەکەیەکی دزێو دائەنرێ بۆ ئافرەتی تەواو مێینە . ئیتر چۆن ئافرەت بتوانێ گەشە بە توانا ذهنی‌یەکەی بدا ، وە چۆن پلەی زیرەکی خۆی دەربخا ، زیرەکی ئافرەت پیاوەتی مێردەکەی ئەڕوشێنێ بۆیە ئەبێ ئافرەت زیرەکی یەکەی بشارێتەوە بۆ پاراستنی ژیانی ژن‌و مێردایەتی لە داتەپین‌و ڕووخان ، بەم جۆرە هەموو ژنان نەفام دەر ئەچن ، چونکە نەفامی بە مانای سەرکەوتنی شووکردنە .**

بەڵام ئافرەت لەم ساڵانەی دوایدا لە ڕێی ئیشکردنی لە دەرەوەی ماڵ‌و سەربەخۆیی ئابووری‌یەوە ، ڕازی نی‌یە مل کەچی مێردەکەی بێ ، چونکە ئیتر هەر ئەو بەخێوکەری نیەو جێ ژیانی لەو کرێ‌بەدا ئەدۆزێتەوە کە لە ئیشەکەیدا دەستی ئەکەوێ‌و سەر بەخۆیی ئابووری یارمەتی ئەدا ، وەك سەر بەخۆیی پیاو لە باری ئابوری‌و کۆمەلایەتی‌یەوە.

وە ئێستا لە زۆر کۆمەلگادا ئافرەت لەشی لە دەست خۆیابەتی ، وە هەروەها ئەو سەربەستی‌یە کۆمەلایەتی‌و کەسایەتی‌و جنسیەشی بە دەست هێناوە کە پیاو هەیەتی ، تەنانەت مافی ئەوەشی هەیە منداڵەکانی بە ناوی ئەوەوە بانگ بکرێن .

زاناکان ئەوەیان ڕەچاو کردووە کە سیفاتی ئەو ژنە تازانە بە تەواوی جیاوازە لەو سیفاتانەی کە فرۆیدو هاوەڵەکانی وەسفیان کردووە . چونکە ئەو جۆرە ئافرەتانە خاوەنی شەخسیەتێکی بەهێزن ، ئازان ، خاوەن ڕەئی خۆیانن، لە کاروباری ئیش‌کردن‌و ژیان‌و سێکسدا ئیجابیانە هەڵس‌و کەوت ئەکەن ، تەعەدا کردن‌و مل‌کەچی‌و لێدانیان خۆش ناوێ ، وەتوانا ذهنی‌یەکانیان لە دوای (٣٠) ساڵ بێ‌هێز نابێ ، خۆش هیوایی‌و بەرزەمنەکانیان لە هی پیاو کەمتر نی‌یە .

بەم پێ‌یە هیچ شتێك لە بەردەم ئەم دیاردە تازەیە لە ئافرەتدا قووت نابێتەوە ئەم دوو شتە نەبێ : یان ئەوەیە بیردۆزی فرۆیدو هاوەڵەکانی سەبارەت بە ئافرەت هەڵەیەو لە تێگەیشتنی ڕاستی سروشتی ئافرەت دوورکەوتۆتەوە ، یان‌ئەوە تا ئەو جۆرە ئافرەتانە ناسروشتی‌و شازو لادەرن . زۆر لە پیاوان مەیلیان بە لای ڕای دووەمدا دەشکێتەوە ، چونکە تەنها ڕایەکە لەگەڵ بەرژەوندیانا ئەڕوا ، هەموو یەکێ لەوان سەرۆکی خێزانێکی باوکانەن‌و پێویستیان بە ژنێکی مل‌کەچە بۆ خزمەت کردنیان ، بەڵام هەمیشە ئەو پیاوانە هەبوون « هەرچەند کە مێش بوون » کە بیرو باوەڕە زانستی‌و مرۆڤایەتی‌یەکانەوە دوور لە بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان دەنگیان لێ هەڵبڕیوەو بە ڕاستی‌و زانستی‌و وتویانە « فرۆید هەڵەیەو ئافرەت ڕاست »ە ، دیسان هەستیان کردووە کە بەرژەوندیان وەکو پیاوانێکی ڕووناکبیر لەگەڵ ئافرەتی تازەی بە هێزدا نەبێ نابێ ، ئافرەتی سەربەخۆ ، ئازا ، زیرەك ، ئیجابی ، ئازاد ، ئەم ئافرەتە ئەتوانێ لە مانای خۆشەویستی ڕاستەقینەو لە مانای « ژیان ، ئیش، ئالوگۆڕکردن، سێکس ، دایکایەتی ، باوکایەتی » تێ‌بگا وە لە گەڵیا پیاوی ڕووناکبیر ئەتوانێ چێژێکی قوڵترو خۆشترو مرۆڤانەتر لە ژیان وەرگرێ .

وە لە گەڵیا پیاوی ڕووناکبیر هەست دەکات ئەو پەیوەندی‌یەی کە پێکیەوەی بەستوون، پەیوەندی‌بەکی ڕاستگۆو سەربەست‌و بنچینەکەی هەڵبژاردنە ، نەك ئەو پەیوندی‌یە کۆنە ئیجباری‌یەی کە بنچینەکەی ترس‌و برسێتی‌و گەڕان بە دوای جێ ژیاندا بووە

(١) بەرزەمن Superego یاسای ڕەوشتی مرۆڤە ، کە لە دەرەوەی « خود »دا ئەش‌و نما دەکا ، وەکو ئەنجامی چاوەدێرکردنی منداڵ لە هەڵس‌و کەوتەکان‌و بایەخەکانی باوك‌و دایکی ، وە تێبینی‌کردنی ئەو شتانەی پاك‌و باشن‌و ئەو شتانەی خراپ‌و گوناحن . ئەمەش لە دوو بەش پێك دێت :
(أ) خودی ئایدیالی
(ب) ویژدان Psyche
بۆ ئەم مەبەستە بڕوانە کتێبی « فەلسەفەی جوانی و هونەر »ەکەی کەمال میراودەلی .

(٢) ئەم نووسینە لە « الانثى هى الاصل » ەکەی دکتورە نوال السعداوى وەگێراوە .

# بەرەو پێشکەوتن

لەو ماوەیەدا کە گۆڤارەکەمان لە ژێر چاپدا بوو کاروانی نەوەستاوی ڕۆشنبیریی لە چالاکیەکانی خۆیداو لە بەرەو پێشەوە بردنی وشەی پاکی کوردیو خزمەتی ئەدەبو ڕۆشنبیریماندا بەردەوام بوو .. چ بە هۆی کۆڕو مەهرەجان بەستنو چ بە هۆی چاپەمەنی نوێوە کە چەندەها کتێبو گۆڤارو ڕۆژنامە بەرهەمی ئەدیبانی لە دوو توێ گرت .. جا ئیتر دانانو نووسین بێ یا وەرگێڕان .. ئەمەش پوختەی چالاکیە ڕۆشنبیریەکانی ئەم ماوەیەی دواییە ..

## کۆڕو کۆمەڵ و مەهرەجان بەستن

یەکێتی نووسەرانیکورد .. بە هەموو لقەکانیەوە لە سلێمانیو هەولێرو دهۆکدا سەرەڕای مەڵبەندی گشتی لە بەغدا بەردەوام کۆڕی خۆیان لە وەرزی ڕۆشنبیریاندا بەستوە ..

● لقی سلێمانی لە سەرەتای ئەم ساڵدا دیدارێکی خنجیلانەی بۆ ئەدەبی منداڵان ساز کردو لەم دیدارەدا زوربەی هەرەزۆری ئەو ئەدیبانەی بۆ منداڵانی کورد دەنووسن بەشداریان تێدا کردو بەدەمەتەقێ لێکۆڵینەوەو باسو وتار پێشکەش کردن هەنگاوێکی گەورەو پڕ لە شانازیان بەرەو پێشەوە نا لە ئەدەبی منداڵانمان دا ..

لە یادی « ٧٥ » ساڵەی لە دایك بوونی « گۆران »ی مەزندا مامۆستایان محەمەدی مەلا کەریمو محەمەد ڕەسوڵ هاوارو ئومێد ئاشناو کەمال میراودەلیو محەمەد فەریق حەسەن .. بە شیعرو وتارو لێکۆڵینەوە پێشکەش کردن بەشداریان تێدا کرد .

دوو کۆڕی ڕەخنەیش گیرا .. یەکێکیان کاك حەمە سەعید حەسەن لێکۆڵینەوەیێکی ڕەخنەیی دەربارەی کتێبی « ئافرەت لە چیرۆکی کوردی دا » پێشکەش کرد .. ئەوی تریان کاك ئەحمەد محەمەد ئابلاخی لە مەڕ ڕەخنەی کوردی ئەمڕۆمان باسێکی پێشکەش کرد ..

● لە مەڵبەندی گشتی یەکێتیدا

ـ کۆڕێك بە ناونیشانی « ڕەشبینیو گەشبینی لە ئەدەب دا » شاعیری لاو کاك عەبدولکەریم دەشتی پێشکەشی کرد ..

ـ مامۆستا جەمیل ڕۆژبەیانی دەربارەی میرنشینی کۆنی موکریان باسێکی درێژی پێشکەش کرد ..

ـ مرۆڤێکی ئاسایی .. شانۆوێکی کوردی بوو لە نووسینی ڕەوف حەسەن بۆ ماوەی پێنج ڕۆژ لە بەغدا لە لایەن هونەرمەندان [ بەرزان عوسمان ، پەیمان عەلی حەسەن عەلی ، حەمە عەلی حەسەن ، مستەفا قەسیم ، کەریم عوسمان ]ەوە پێشکەش کرا

ـ لەم دواییەشدا کۆڕێکی شعر خوێندنەوە گیرا کە چەند شاعیرێکی لاو بەشداریان تێدا کرد لەوانە عەبدوللا عەباس ، عەبدولکەریم دەشتی ، مارف عومەر گوڵ ، موئەیەد ئەیووب بو ..

جگە لە کۆڕێکی تایبەتی کە بۆ کاك ئەبوبەکری خۆشناو دەربارەی فەلسەفە ساز کرابوو .

● لقی هەولێر یەکێتی نووسەرانی کوردیش کۆڕێکی فراوانی بۆ لێکۆڵینەوەو ڕەخنەگرتن بەست دەربارەی کۆمەڵە چیرۆکی « توێشووی سەفەرێکی سەخت »ی مامۆستا حسین عارف .. کە شێرکۆ بێکەسی شاعیرو ڕەوف حەسەن تێیدا بەشداربوون.

لەوەوبەریش مامۆستا کەریم شارەزا لێکۆڵینەوەیێکی بەناونیشانی « کانی شاعیری مەیو عشق پێشکەش کرد .. کاك مەحمود زامداریش دەربارەی مەسەلەی فەلەستین لە شیعری کوردیدا کۆڕێکی فراوانی گیرا .

هەر لە باسیکۆڕوکۆمە لە ڕوشنبیریەکانی ئەم ماوەیەدا کۆمەڵەی ڕۆشنبیریی کوردیو بە ڕێوەبەرێتی ڕۆشنبیریی جەماوەر چالاکی خۆیان لەم

بوارەدا نواند .

لە بارەگای کۆمەڵە لە بەغدا کاك ئەحمـــــەد سالاری هونەرمەند کۆڕێکی فراوانی دەربارەی شانۆ بەستو لێکۆڵینەوەیکی دەربارەی سەرەتای دراما تێدا پێشکەش کرد .. هەروەها دکتۆر ئیبراهیمی عەزیزیش لە هۆڵی کۆمەڵـــــەی رۆشنبیری کوردا کۆڕێکی زماناسی گیرا .

بەڕێوە بەرێتی ڕۆشنبیری جەماوەر لە سلێمانی چەند کۆڕێکی ئەدەبیو شیعر خوێندنەوەی گـــرت و چەندان شاعیرو ئەدیب لە نەوە جیاکان بەشداریان کرد سەرەرای کۆرێك بە ناوی «فەلسەفەوزانستی» یەوە کە بۆ شاعیری لاو ناسر حەفید ئامادەکرابوو .

دەزگای ڕۆشنبیری وبلاوکردنەوەی کوردیـــش لەم ماوەیەدا مەهرەجانی ڕۆشنبیری لە کۆتایی مانگی نیساندا لە شاری هەولێر داگرت .

## چاپەمەنیە کوردیکان

لە ڕاستیدا هێندی کتێب ونامیلکە و چاپەمەنیتر لەم ماوەیەدا دەرچوو کە نەتوانین هەموویان بەرێـــك وپێکی بخەینە بەر چاوی خوێنەران .. ئە مانە بــــە شێکن لەو بەرهەمانە :

ـ دیوانی قانیع : بە « ١٥ » هەزار دانە کـــاك بورهان قانیع بەچاپی گەیاندوە سەرەرای پێشەکـــی نووسینو سەرپەرشتی کردنی چاپکردنی ..

ـ دیوانی بێکەس .. بە «١٠» هەزار دانــــە دەرچوو .. کاك محەمەدی مەلاکەریم پێشەکی بـــۆ نووسیوموسەرپەشتی لە چاپدانی کردوە .. لەوەو بەریش هەر کاك محەمەد کتێبێکی نوێی بەنـــاوی « نالی لە کلاورۆژنەی شیعرەکانیەوە » دەرکرد .

ـ دەزگای ڕۆشنبیری وبلاوکردنـەوەی کوردی لەم ماوەیەدا لە چاپکردنو بلاوکردنەوەی چەنـــد کتێبێك بۆوە ، لەوانە ئەفسانە کوێرئوغلی : رۆمانێکی بەشارکەماله ومامۆستا شوکر مـــــستەفا لەتورکیەوە کردوویە بەکوردی .

شەش وتار دەربــــارەی شـــیعری نـوێو تاقیکردنەوە .. کتێبێکی نوێی کاك عەبدوللا عەباسی شاعیرەو لەسەر شێوەو ناوەرۆکی شیعری ســــەردەم دەدوێ ..

هەروەها زێڕینو کاڵێ : شەش چیرۆکـــــی منداڵانەیەو کاکە جەمال محەمــــەدی شاعیر لەشێوە فۆلکلۆریە کانیەوە خستوونیەتە قاڵبێکی نوێ وە ..

سەرەڕای گۆڤاری بەیانو ڕۆژنامەی هاوکاری کە بەردەوام دەردەچن .

لەلایەکیترەوە مامۆستا عەزیز گەردی بەبـــێ دەنگ خەریکی پێشکەش کردنی خزمەت گوزاریە کانی خویەتی بەئەدەبەکەمان و لەم ماوەیەدا لەزمانــــی ئنگلیزیەوە کتێبی « بـــــەرازەوان » و « چیرۆکـــی بەرئاگردان » و « قورینگ »ی بــەکوردی وەرگێڕاو بلاوی‌کردنەوە ..

دکتۆر ئەوڕەحمانی حاجی مارفیش لێکۆڵینەوە یێکی زانستیانەی زماناســـی لە دووتوێی کتێبێکی بەقـــــەوارەدا بە ناونیشـــــانی « ڕێزمانی کوردی » بلاوکردەوە .

دکتۆر عیزە دین مــستەفا ڕەسوول دوا بە دوای کتێبە با یەخدارەکەی « ئەحمەدی‌خانی » کە بەزمانی عەرەبی بلاوی کردەوە کتێبێکی تری بەناوی « شێخ ڕەزای تالەبانیی دوور لە شیعری شەڕەجوێن دەرکرد کە لێکۆلینە وەیەکە دەربارەی شیعرەکانی تری شێخ .

دکتۆر کوردستانی موکریانی .. کتێبێکــــــی دەربارەی شیعری ئافرەتە شاعیرەکانی کوردمــــان بلاوکردەوە کە تێیدا لە شیعری شاعیرەئافرەتە کانــی کورد دەکۆلێتەوە و بە شـــــێکی شیعرەکانی خـۆی تیابلاوکردۆتەوە ..

هەر لەم ماوەیەدا «پەیڤ» مانای «وشە» لــە شێوەی گۆڤارێكدا بە دایلەکتی کرمـانجی ژووروو دەرچوو کە بەرهەمی شیعرو چـیرۆك ولێکۆلینەوەی کۆمەڵێ ئە دیبانی تێدا بلاوکراوەتـەوە ســــەرەڕای هەواڵە کانی یەکێتی نووســــەرانی کورد .. کـــە یەکێتیش یارمەتی لەچاپدانی داوە .

گۆڤاری ڕۆژی کوردستان ژمارە «٥٧» کـــە کۆمەڵەی ڕۆشنبیری کوردی دەری دەکات بە بابەتی هەمە ڕەنگی عەرەبیو کورد یەوە کەوتە بازاڕەوە

# یانەی ڕۆشنبیران

هاوڕێکانم .. ماوەیەکی دوورو درێژ بوو بەرهەم‌و نامەکانتان دەگەیشتنە ئەم گۆڤارە .. بەڵام نە وەڵامێک‌و نە هەواڵێکی نووسینەکانتان دەسگیر نەدەبوو .. جا بۆ دڵنیایی ئێوە ی‌خۆشەویست .. بۆ ئەوەش کە پێوەندی‌یێکی ڕاستەوخۆو بەهێزتر پێکمانەوە ببەستێتەوەو باشتریش لە هەواڵی . یێکتری ئاگادار بین .. وا ئەم گۆشەیەمان لە گۆڤارەکەتان‌دا کردەوەو دەتوانن بە هۆیەوە سەرو سۆراخی وتارو نامەو بەرهەمەکانتان ببەستن .

● کاکە سەربەست عبدالعزیز بهاءالدین ـ بەغدا

نووسینەکەت « چۆن ڕێزی لێکۆڵینەوەی زانستی بگرین ؟ » بەشی زۆریت بۆ داکۆکی کردن لە ( کتێبێك ) تەرخان کردبوو کە شایانی ئەوە نەبوو .. دەبوایە خەریکی گەوهەری باسەکە بوویتایە نەك چەند جەمسەرێکی .. چاوەڕوانی بەرهەمی باشترین

● کاکە « ك . و » لە سلێمانیەوە ..

نووسینەکەت

بە ناونیشانی « کەسێتی فێرکار بەلای مامۆستاوە » ڕاستی زۆری تێدابوو .. هەروەها ئەو کەم‌و کوڕی‌و ناتەواویانەی لە قوتابخانەدا هەستی پێ دەکرێ خستبووتە ڕوو .. ئێمە لە کاتێك‌دا کە بەتەواوی پشتگیری ڕایەکانت دەکەین‌و پیشەی مامۆستا بە پیرۆزیەوە تەماشا دەکەین .. هیوامان وایە کە ئەو مامۆستایانەی بە ڕێبازی پەروەردەیی کۆن‌دا دەڕۆن بگەنە ئاستی پایەو بەهای مامۆستای ڕاستەقینەی سەردەم‌و سوپاس .

● کاکە عبدالمجید وهاب صالح ـ لە زانکۆی سلێمانیەوە

« ڕوون کردنەوە » کەت لەمەڕ چاپخانەی زانکۆی سلێمانی‌و چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد .. تەنیا کاری دڵسۆزانەو بەرهەم‌و چاپکراوی بەنرخ هەموو هەقیقەتێك ساغ دەکاتەوە .. ئیتر چاپخانەکە گرانبەها بێ یا هەرزان ئەمەیان گرینگ نیەو سوپاس

● بۆ خاوەنی وتاری « چاوگێڕانێك بە ئەو تەرازووەی ڕەخنەی کێتبەکەی پێ کێشرا » ..

لیژنەی هەڵسەنگاندنی بەرهەم لەم گۆڤارەدا بڕیاریان دا کە دەرگای ئەو باسە دابخەن گەرچی نووسینەکەت ڕوونکردنە وەو بۆچوونی باشیشی تێدا بوو ..

● بۆ خاوەنی وتاری

« هونەرو شیعرو جەماوەر » وتارێکی ئامادە کراوی سوودمەند بوو لە ڕوانگەیێکی پێشکەوتنخوازانەشەوە سەیری ئەدەب‌و هونەری تیا کرابوو .. خۆزگە کەمێ زمانەکەی ڕەوانتر بوایە .. چاوەڕوانی بەرهەمی ترین .

بۆ خاوەنی وتاری « سەرنجێکی دڵسۆزانە » لە سلێمانیەوە

کاکی برا ئەوەی دەربارەی هونەر بڵاو دەکرێتەوە بەزۆری هونەرمەنداندو ئەندامانی تیپە هونەریەکان خۆیان دەی‌نووسن ئاستی ڕەخنەی هونەریمان ئەوەیە کە هەیە .. ئێوەش لەمەوبەر لێکۆڵینەوەی هونەری سوودمەندو تێرو تەسەلتان بڵاو کردۆتەوە .. چاوەڕوانینو ئومێدەواریشین لەو نووسینو لێکۆڵینەوانەدا بەردەوام بن و بە هێمنیو لەسەر خۆش ڕاکانی خۆت بخەرە پێش چاوی نووسەرانو ڕەخنەگرانی تر ..

● بۆ دکتۆر شۆی بەڕێز

لیژنەی گۆڤارەکەمان دوای سوپاسێکی بێ پایانت .. ڕایان وایە کە بەڕێزتان لە شیعری کوردیماندا مامۆستای قوتابخانەیێکی تایبەتینو چاوەڕوانی شیعرین نەك چیرۆك .. لەگەڵ ڕێزو سوپاسماندا .

● بۆ خاوەنی وتاری « لە بەینی فۆلکلورو شیعری میللی دا » لە هەولێرەوە

ڕاستە فۆلکلۆر خاوەنی ناسراوی نیەو بۆتە مولکی میللەت هەمووی ، بەڵام شیعری میللی بابەتێکی جیاوازەو خاوەنی زوربەیان دەناسرێن .. دیارە شیعرە فۆلکلۆریەکانیش لە سەرەتادا خاوەنیان هەبوە .. چونکە ڕێی تێ ناچێ کۆمەڵێ کەس دانیشتبنو پێکەوە شیعرێکیان ڕێك‌خستبێ .. ئەوە هەیە هەندێ کەس لێی زیادو کەم کردوونەتەوە .. حەزمان دەکرد وتارەکەت کورتو پوختتر بوایە .. چاوەڕوانی بەرهەمی دیکەین .

● کاکە ابو بکر قەرەداغی

وتارە وەرگێڕراوەکەت « مۆسیقای ناوەوە لە قەسیدەی نوێدا » .. بە شێوەیێکی ئەوتۆ نەبوو لێی لێ‌بکەین ئەویش بەهۆی ناڕەوانی زمانەکەیەوە .. ئەم جۆرە باسانە زۆر ناسکنو پێویستمانە لە شیعری کوردیدا بەووردی باسی لێ بکرێ .. هیوامان وایە لەم بارەیەوە بەرهەمی ترمان بۆ بنێری .

● کاکە مغدید حاجی ـ لە هەولێرەوە ..

دەربارەی ئەو کۆڕەی کە لە هەولێر گیرابوو ڕۆژنامەکان بە درێژی لە سەریان نووسی .. ببوورە کە بڵاومان نەکردەوە .

● کاکە یعقوب قصاب ـ لە هەولێرەوە .

وتارەکەت « دەرفەت بدە بە منداڵت تێ فێربێت .. » لە ڕاستیدا باسێکی بەکەڵکەو سوپاسی ئەو هەموو دڵسۆزیەت دەکەین .. بەڵام ئەوەی جێگەی داخە زمانەکەی ڕەوان نیە .. داوای لێبوردن دەکەین .

● بۆ کاکە محمد عبدالله مصطفی ـ لە سلێمانیەوە

وتارەکەت « پیداچوونەوەیێك بە ( خالقیو دەنگو ئاواز )دا » وەك خۆت وتووتە نیازت وایە بە درێژی لە نامیلکەیێکدا چاپی بکەیت .. ئێمەش هەر وامان بە پەسەند زانی .

● کاکە نەوزاد احمد اسود

لێکۆڵینەوەکەت « سێکسو چەند تێبینیەك »

باسێکی زانستیانەو کۆمەڵایەتیانەی بەهادارە.. بە جورئەتەوە کێشەکەت خستۆتە ڕوو .. ئێمەش لەگەڵتا دەڵێین پێویستە ئەم زانستیانە بەشێوە مرۆڤایەتیەکە بخرێتە سەر مەحەکی لێکۆڵینەوە هیچ کەمو کووریەکمان بە لێکۆڵینەوەکەتەوە نەدی .. چەند حەزیشمان دەکرد بڵاو بکرێتەوە .. بەڵام ئەو قۆناغەی ئێستای وڵاتو هەندێ بیروڕای کۆمەڵایەتی دواکەوتوو دەبووە هۆی گیروگرفت خستنەوە .. داوای لێبوردن دەکەین لەگەڵ ڕێزو سوپاسمان دا .

● کاکە احمد قادر سعید ـ لە قەڵادزێوە

دەربارەی چیرۆکی « دیموکراتی قەدەغەیە »ی عەزیز نەسین بە وەرگێڕانەکەی تۆوە سێ وەرگێڕانیمان بۆ هاتبوو .. کە یەکێکشیان ئەوەکەی « هوشیار سیوەیلی » بوو .. دوای بەراوردێکی دڵسۆزانە .. بۆمان ڕوون بۆوە کە ئەوەی بڵاو کرابۆوە خاوەنەکەی وەری‌گێڕابوو .. بەڵام جێگەی داخیشە کە وەرگێڕانەکەی جەنابیشتان زۆر پوختو ڕەوان بوو .. کەچی گۆڤاری بەیان بەهۆی دواکەوتنی چاپەوەو ئاگادار نەبوونی لە « ڕۆشبیری نوێ » ئەو وەرگێڕانەی تر بڵاوکرایەوەو نەش‌دەکرا جارێکی تریش دووبارە ببێتەوە ..

وەکو بەڕێزیشتان دەڵێن .. هەموومان هەر یێك مەبەستمان هەیەو ئەویش خزمەتی ڕۆشنبیریی‌و وشەی کوردی پاکەو هیوامان وایە لە بەرهەمو چیرۆکی ڕەنگینت بێ‌بەشمان نەکەیتو سوپاس .

● کاکە نەبەزی احمد بچکۆل سلێمانی

نامەو شیعرەکەت گەیشت .. ئەوەی لە نامەکەتدا نووسیوتە زۆر ڕاستە .. ئایا ئەو شیعرو

بەرهەمـــانەت نەدیوە کە لە پۆستەی خوێنـــەراندا بەشێکی لێ بڵاو دەکەنەوە ؟ ! بە بەراوردێکی بچکۆلانە لەگەڵ هەندێ بەرهەمی بڵاوکراوەی تردا دەردەکەوێت کە لەوانە بەپیتو بەپێزترن .. هەر لەبەر ئەمەشـــە لێرەدا کۆپلەیێکی شـــیعرەکەت بڵاو دەکەینـــەوەو بێگومانیشین لە بەهرەو تواناتو هیواداریشین بایەخ بە لایەنی هونەری زیاتر بدەیت .. بۆیە هەمووشیمان بڵاونەکردەوە چونکە گۆڤارەکەمان تایبەتیـــە بەبابەتی ڕۆشنبیری‌گشتیەوە نەك ئەدەب .

« فرمێسك »

**من سوێند دەخۆم**
**ئەگەر غەمی ئەم جیهانە**
**وەکو کاسە ژەهرێ وابێ**
**دەیخۆمەوە .. دەیخۆمەوە .. بە مەرجێك**
**فرمێسك نەمێنێ**
**لە سەرچاوی هیچ ساوایێك .**

● کاکە یاسین وەرزێر لە سلێمانیەوە

شیعرەکەت « بیرت دەکەم » هەستو سۆزی شاعیرانەی تیایە .. بە سوپاسەوە هێندەی لێ بڵاو دەکەینەوە

**چەند ڕۆژێ بوو لەو دیو سنوور**
**بیرم دەکردی دوور بەدوور**
**بیرکردنی هاوسەری خەم**
**بیرکردنی ( وەلی ) بۆ ( شەم ) .**

● کاکە محمود لطیف فرج ـ لە کەرکووکەوە ..

کاکی برا .. ئەو زانیاریانەی دەربارەی شاری هەولێر ناردووتە .. لەمەوبەر بە کتێبو بە وتارو بە درێژیش بڵاوکراونەتەوە .. بمانبەخشە ..

● کاکە حکیم حمە عزیز ـ لە سێوسێنانەوە

پەخشانەکەت بە ناونیشانی « ڕاوە کەو » زمانو ڕێنووسەکەی چاکە .. بەڵام پەخشانی ئەمڕۆ لـــە داوی شێوە تەقلیدیەکە قوتار بوەو شێوەی هونەریی نوێتری وەرگرتوە .. لەسەر هەردوو دیوی پەڕەکەش نووسیبوت .. ببوورە .

● کاکە احمد غەمگین ـ لە پێنجوێنەوە ..

ئەو شیعرەی بۆ پاشکۆ کوردیەکەی « العراق » ناردبووت

نازانین بۆ گەیشتبوە لای ئێمە .. جا لەبـــەر ئەوەی پاشکۆکە لە دەزگایێکی تر دەردەچێ بۆیـــە ئێمەش بۆمان ڕەوانەی ئەوێ کردی ..

● بۆ کاکە برهان توفیق زەنگنە ـ لە سویدەوە ـ

کاکی برا .. ئابوونەی ســـاڵانەی هـــەردوو گۆڤاری ڕۆشنبیری‌نوێو بەیانو هـــەروەها ڕۆژنامەی هاوکاریش .. هەموویان تەنیا چوار دنیارو نیوە .. هەر کاتێ ئابوونەکەو ناونیشانی تەواوی خۆتمان پێ گەیشت بەڕێك‌وپێکی چاپەمەنێکانت بۆ دەنێرین .

● بۆ هاوڕێمان « پەیمان عوسمان محمد » لـــە سلێمانی

ئەمە بەشێکی ئەو پەندە بەنرخانەیە کـــە بۆت ناردووین لەگەڵ سوپاسمان دا

ـ بلبل کولانە لە قەفەزدا دانانێ .. نـــەوەك دیلێتی بۆ بێچوەکانی بەجێ بێڵێ .

ـ مەمرە بۆ گوڵێکی خاك بەسەر .. بمرە بـــۆ خاکێکی گوڵ پەروەر .

● کاکە سلام محمد مصرف ـ لە خانەقینەوە

به هاوڕێیەتیت زۆر شادمانین .

● کاکە نجاة نجم‌الدین کاکەیی :

نووسینەکەت گەیشت .. لەگەڵ تۆدا دەڵێین ئەو بەندو باوە پڕوپووچانەی دەخرێتە پاڵ برا کاکەییە کانمان گشتی لە نەزانینەوەیەو کاکەییەکان بەشێکی دڵسۆزن لە نەتەوەکەمانو شایانی ڕێزن .

دەربارەی « بەرزۆی پەری کاکەیی »ش لەسەر هەردوودیوی کاغەزەکە نووسیبووت .. هیوادارین شتی سوودمەندترمان بۆ بنێری .

● کاکە هاوڕێ قادر ـ لە بەغداوە ـ

کورتە چیرۆکەکەت « گومـــان » لایەنی هونەری ناتەواو هاتە پێش چاومان .. بمانبەخشە .

● برایان کاوە حسن و بکر امین لە سلێمانیەوە ..

کاکە ناسۆر دەربەندی لە دەربەندیخانەوە ، کاکە شێواوو کاکە عادل محمد غەمبار کـــە ناونیشانیـــان نەنووسیوە ..

نامەو شیعرەکانتان گەیشت . هەندێکیان بـــە ئوسلووبی کۆن نووسرابوونو بڕێکیشـــیان لایـــەنی هونەریان کامڵ نەبوو هیوادارین لە هەوڵو کۆشتاندا بەردەوام بن .

# یەکی ئایار

هەموو ساڵێ لە سەرانەری جیهاندا کرێکاران بە نهێنیو بە ئاشکرا ئاهەنگ دەگێڕنو خۆپیشاندان ڕێك دەخەنو لە کۆڕو کۆمەلە کانیان لە بارو گوزەرانی خۆیان دەدوێنو دروشمی ئامانجەکانیان هەڵ دەگرنو هەستی چینایەتی خۆیان زاخاو دەدەنەوەو ڕیزەکانیان یەك دەخەنو تەوژمو تین بە خەباتی مەردانەو دلێرانەیان دەدەن .. ئەمەش هەمووی لە پێناوی بەدیهێنانی دادپەروەریەکی کۆمەڵایەتی ئەوتۆ کە تێکڕا هاووڵاتیان .. مرۆڤانی سەر ئەم گۆی زەمینە لەسایەی ڕژێمێکی مرۆڤانەی پڕ لە ئاسوودەگیدا بژین ..

لەم ڕۆژەدا .. بیرەوەری ئەو ڕاپەڕینە مەزنەی کرێکارانی شاری شیکاگۆی ئەمەریکا دەکەنەوە . کە سەرجەم کرێکارو چەوساوەی ئەوشارە لە گۆڕەپانو کارگەو شۆستەو شەقامەکاندا چەند دروشمو داواکاریەکی ڕەوای خۆیان هەلگرتبوو .. لەو ساڵەدا ساڵی ١٨٨٦ و لە (١)ی ئایادا دەیانویست لە ڕۆژێك تەنیا هەشت سەعات کاربکەن وە ڕازیبوون بە هەشت ساعات چەوساندنەوە لە پێناوی پاروەنانی ماڵو منداڵیاندا .. داوای ئەوەیان دەکرد مامەلەیێکی مرۆڤایەتیانەیان لە گەڵدا بکەن .. بەلام بە کرێگیراوانی دەسەڵاتی سەرمایەداری توانییان پیلانێکی بێ مروەتانە بگێڕنو چوار سەرکردەی دلێری کرێکاران تووش بکەنو ئەنجام هەر چواریان لە سێدارە دران .. بەلام لە ژێر زەبری جەماوەراندا دوای دوو ساڵ دادگا ناچارکرا چاو بە پیلانەکەدا بگێڕێتەوەو فەرمانی بێتاوانیان بۆ دەربکا .. ئیتر لەوساوە ئەم ڕۆژە کرایە جەژنی کرێکار لە جیهاندا ..

بێگومان کرێکارانی وڵاتەکەمان هەموو ساڵێ لەم ڕۆژەدا بە شداریەکی ڕاستەوخۆیانەی ئەم جەژنو بیرەوەریە دەکەنو کرێکارانی ئێمەش دەورێکی پڕ لە شکۆو شانازیان هەیە لە کاروانی خەباتی سەختی چینایەتیاندا و گەر چاوێ بە مێژووی ڕاپەڕینو مانگرتنو خۆپیشاندانەکانیاندا بخشێنین ئەم حەقیقەتە وەك ڕۆژ دەدرەوشێتەوە ئەوەتا هەر لە دروستبوونی حکوومەتی عیراقەوەو لە ساڵانی بیستەکانەوە کرێکارانی کوردو عەرەبو کەمایەتیەکان لە سەرجەم شارەکانی عێراقدا بەگیانێکی نەترسەوە لە کارگەو بەندەرو ڕێگەوبانو تەلەفۆنو بروسکەو بەریدو کارگەی نەوتو نەوت پالێوو چیمەنتۆو چنینو .. هتد وە بە گژ ئەو داموو دەزگایانەدا دەچوون کە بە هەموو جۆرێ لە ڕەنجی تەلارو گوزەرانی پاشایانەیان بۆ خۆیان دروستدەکرد بۆ ئەمەش هەرچی زەبرو زەنگو کوشتنو بڕین هەیە بۆ چاوترسێنی کریکاران بە کاریان دەهێناو سەربەستی نەقابەو ڕێکخراوو کۆڕو کۆمەلیان لێ قەدەغە دەکردن .. بەلام هەرچیەکیان کرد نەیانتوانی هەستی چینایەتیو گیانی شۆڕشگێڕیان تیا کپ بکەن .. تا لە شۆڕشی تەمووزی ١٩٥٨ دا جەماوەری چەوساوە بەسەر خوێنمژەکانیاندا سەرکەوتنو ئیتر دەسکەوتو کۆڕو کۆمەلەکانیان فراوانتر بوو .. دوای ساڵی ١٩٧٠ یش جەماوەری کرێکاران دەستکەوتی باش باشیان بۆهاتەدی ، بەتایبەتی لەدوای دەرچوونی یاسای ژمارە ١٥١ لەلایەن سەرکردایەتی پارتی بەعسی عەرەبی سوشیالیست کە کریکاران بە هۆیەوە دەورو ژیانیان گۆراو کەوتنە قۆناخێکی پێشکەوتو ترەوە ، چونکە تێکرای ئەو یاساو پرۆژانەی بۆ چارە سەرکردنی گیروگرفتی ئابوری کرێکاران دەرئەچوون گوزەرانیو دەرامەتی پاشەڕۆژی بۆ مسۆگەر ئەکردنو ڕێزەکانیانی لە سەرکردایەتی یەکێتی نەقابەکان پتەوترو بە هێزتر ئەکرد .

بە هەڵی ئەزانین کە لە بیرەوەری یەکی ئایارو لە جەژنی کرێکارانی جیهاندا پڕ بە دڵ پیرۆزبایی لە کریکانیعیراق بە کوردو عەرەب بەتایبەتیو هەموو کرێکارانی گیتی بە گشتی بکەین .. بڕوامان بە ڕێبازی کرێکاران بە تینتر دەکەینەوە کە ئاواتو خواستەکانیان بەدی دێننو لە پاشە ڕۆژدابە تێکوشانو خەباتی بێووچانیان ڕژێمی سەرمایەداریو ئیمپریالزم لە جیهاندا لە ڕەگو ریشە هەڵئەکێشی بۆ ئەوەی سەرجەم کۆمەلانی خەلکیو نەتەوە ماف خوراوەکان بە ئازادیو ئاسودەییو بێ چەوسانەوەو ماف پێشێلکردن بحەسینەوە .


رئیس التحریر اسماعیل رسول
نائب رئیس التحریر فائق جمیل
نرخی ٥٠ فلسە
ئەم ژمارەیە ١٤٠٠٠ دانەیلێ چاپکراوە
طبع بمطبعة الزمان - بغداد
رقم الایداع فی المكتبة الوطنیة ببغداد ١١٢ لسنة ١٩٧٩

